# د فۆلكلۆرا كوردى

## ده سەردەستیەكە ژنان

### رۆهات

ئەگوهاستن ژ تیپێن لاتینی

**ئازاد عەبدولعەزیز مزویری**



**ناوی کتێب: د فۆلکلۆرا کوردی ده سەردەستیەکە ژنان**

- نووسینی: رۆهات
- گۆڕینی لە پیتی لاتینی: ئازاد عەبدولعەزیز مزویری
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن: ٦٠٣
- تیراژ: ٥٠٠
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب -٨٣- (١٨٦)



**دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی**
**www.mukiryani.com**
**asokareem@maktoob.com**
**Tel: 2260311**

# ناوەڕۆک

## پێشگۆتن

رەنگینی و دەولەمەندییا فۆلکلۆرا کوردی ژ زوودا بالا رۆهلاتناس، کوردناس، فۆلکلۆریستان و گەلەک کەسێن مایین کشاندییە سەر خوە. مرۆڤ نکارە تەنێ فۆلکلۆرێ وەک چەند بەرهەمێن هونەری بحەسبینە. فۆلکلۆر سەربۆرییا جڤاتەکێ یا دیرۆکی، جڤاکی، هونەری و پێشکەتنا زمانێ وێ جڤاتێ نیشان ددە. هەموو ئەڤ یەکان د ناڤ فۆلکلۆرێ دە گیهشتنە هەڤ، د ناڤ هەڤ دە هاتنە هونانَدن، رستن، د داوییێ دە دەڤینەکە چاندی پێک ئانینە، بوونە چاڤکانییێن پۆتانسییەک. ئاکادەمیسیەن و پسپۆرێ فۆلکلۆرێ ئا. ت. گانالانیان، ڤێ دەولەمەندی و رەنگینییا فۆلکلۆرا کوردی وەک «ئانسکلۆپەدییا جڤاتا کورد یا ژیینێ» ب ناڤ دکە. ژ بەر ڤێ یەکێ مرۆڤ پەیڤێن فۆلکلۆر و ژیینێ ژ هەڤ نکارە بدە جوداکرن. مرۆڤ دکارە بێژە، فۆلکلۆر ب خوە ژیینە، لێ بەلێ ژیینەکە کو هونەر و ئەدەبییات ژ خوە رە کرییە پێلەکان. ئەو ژیینا کو ئەم د ناڤ دە نە، دەم – دەم رووسار دبە، جارجار بینا مرۆڤان تەنگ دکە، رژی، بێتام و بێلەزەتە، ب سایا فۆلکلۆرێ خوە گیهاندییە ل سەر سینۆرێن بەدەوییێ. ئەڤ سینۆرێن ژیین، فۆلکلۆر و بەدەوییێ ب ئالیکاریا ئیمکانێن هونەری چاوا ئەم دبینین هەر دچن تەنک، زراڤ، باریک، دبن، ژ نووه ڤە تێن هونانَدن و تێن رستن.



ل کوردستانا ترکییێ ژ بەر رەوشا سیاسی، ژ بەر زۆردەستی، قەدەغەتی و توونەبوونا ئیمکانان، نموونەیێن فۆلکلۆرا کوردی هەم نەهاتنە بەرەڤ کرن، هەم ژی ل سەر ڤان بەرهەمان کار، خەبات و لێکۆلینێن زانستی نەهاتنە پێک ئانین. ژ بەر ڤان دوارییان فۆلکلۆرا کوردی ئیرۆ باش نایێ ناسین. فۆلکلۆر وەک نەینکا جڤاتەکێ یە، مرۆڤ د کارە ب سایا ڤێ نەینکێ، جڤاتەکێ باشتر ناس بکە، ب هێسانی د کارە خوە بگهینە کوورایا سەد سالان. ژ ئالییێ دن، فۆلکلۆر هەم ژ بۆ زمان، هەم ژی، ژ بۆ ئەدەبییاتەکە نووژەن، بنگەه و دەڤینەکە مەزنە. لێ مخابن د ناڤ کوردان دە ئەڤ دەڤینە، ڤەشارتی و سەرگرتی مایە، ممکونە رۆژەکێ ژ رۆژان ئەڤ دەڤینا گرانبها و هێژا ژ هۆلێ رابە، وندا ببە، بحەلە، د رۆ دە هەرە. هێز و چەند دۆربەرێن پۆلیتیک یێن زۆردەست ژی ل ترکییێ ڤێ یەکێ دخوازن، هەول ددن کو هەموو هەبوونێن چاندا کوردی ژ ناڤ راکن، بحەلینن. رۆناکبیر، نڤیسکار، فۆلکلۆریستێن کورد پێویستن پێشیا ڤێ سەفەرا وێرانکرن، کامباخکرنێ و خزانکرنێ بسەکنن، چ دبە برا ببە، پێویستە ئەم هەر نموونەیەکە فۆلکلۆرا کوردی دەرباسی سەر کاغز بکن. ئەڤ کار دیسا دکەڤە ل سەر ملێن کوردان، ل سەر ملێن مە.

فۆلکلۆر، جارنا وەک ئەدەبییاتا دەڤکی، جارنا ژی وەک ب زارگۆتن ژی تێ ب ناڤکرن، ئەدەبییاتەکە کۆللەکتیڤە، خەلکێ ب خوە ئەڤ ئەدەبییاتا ئەفراندییە، نڤیسکارێن ڤێ ئەدەبییاتێ تونەنە، ئەڤ ئەدەبییاتا ب سالان ل سەر زار – زمانا مایە، خوە پاراستییە، خوە نووه کرییە، دەولەمەندکرییە، بوویە مالێ خەلکێ کورد، فۆلکلۆرا کوردی ژی، چاوا ئەم دبینن ژ ڤان قۆناغان رە دەرباس بوویە، هاتییە گهیشتییە ڤان رۆژێن ئیرۆیین و بەشەکە چاندا مرۆڤاهییێ پێک ئانییە.

ئەڤ لێکۆلینا مە، ل سەر بەشەکی فۆلکلۆرا کوردی هاتییە پێک ئانین، مرۆڤ دکارە بێژە خەباتەکە ب سینۆرکرییە، تەنێ د ناڤ فۆلکلۆرا کوردی دە جیهێ ژنان و مۆتیفێن ل سەر تەما ژنان نیشان ددە، پێشکێش دکە. ژ ئالییێ دن ڤێ لێکۆلینێ هەموو نموونەیێن فۆلکلۆرا کوردی ژێ، ژ خوە رە نەکرییە ماتەرییال، نەدایە ل بەر چاڤان، تەنێ مە نموونەیێن خوە، ژ ناڤ چیرۆک، گۆتنێن پێشییا، دەستان و ستران وەک چار بەشێن بنگەهین هلبژارتییە.

گرنگییا ڤێ خەباتا پچووک ئەوە کو جارا پێشین ل سەر فۆلکلۆرا کوردی لێکۆلینەکە ب زمانێ کوردی تێ چێکرن، ژ ئالییێ دن، خەبات ب خوە ژی ل سەر بابەت و تەما ژنانە، ب ڤی تەحری مرۆڤ دکارە بێژە دو رووچکێن ڤێ پرتووکێ هەنە: فۆلکلۆر و ژن، هەر دوو بابەت ژی کەتنە زکێ هەڤ، هەڤ دەولەمەندکرنە. خوەندەڤان ژ ئالیکی دە دکارە ناسییا خوە بدە فۆلکلۆرا کوردی، نموونەیێن ڤێ فۆلکلۆرێ تام بکە، ژ ئالییێ دن بسایا ماتەرییالێن فۆلکلۆریک دەربارەیی جیهێ ژنان و رەوشا ژنان دە دکارە زێتر ئاگاهدار ببە، زانیارییێن خوە پێشتا ببە، نووە بکە. ژ ئالییێ دن دەما ئەڤ پرتووک هاتە بەرچاڤ کرن، خوەندەڤانێ ببینە کو، ژنان د ناڤ فۆلکلۆرا کوردی دا ژ خوە رە تەختەک ئاڤاکرنە، سەردەستیکە (حاکیمییەت) وان هەیە. ب کورتی مرۆڤ دکارە بێژە؛ گۆتن «گۆتنا ژنا»یە. ئەڤ لێکۆلینا، ژ ئالییێ دن دکارە ببە جەسارەت و رەفەرانسەکە پچووک ژ بۆ لێکۆلینێن مایین.

د داوییا ڤێ پرتووکێ دە لیستەکە کو ژ پرتووکێن ل سەر فۆلکلۆرا کوردی پێکهاتی ژی جیە گرتییە، خوەندەڤان و کەسێن کو دخوازن زێتر ل سەر فۆلکلۆرا کوردی ئاگاهداربن، ئەڤ بیبلییۆگرافیا پچەک بە ژی دکارە



ژ وان رە ببە ئالیکار، کێری وان بێ. هەر چقاس ڤێ لیستێ هەموو ماتەرییالێن (وەک پرتووک) ل سەر فۆلکلۆرا کوردی نەهلچاندییە، د ناڤ خوە دە بەرەڤ نەکرییە ژی، لێ بەلێ ئەم دکارن بێژن کو ناڤێن پرانییا پرتووکێن کو هەتا نها ل سەر فۆلکلۆرا کوردی چاپ بوونە، دڤێ بیبلییۆگرافییێ دە جیە گرتنە.

وەک هەر خەباتەکە نووە، سەدی سەد کێماسییێن ڤێ لێکۆلینا مە ژی هەنە، بابەتێن کو ژ بەر چاڤێن مە رەڤییانە ژی هەنە.

ئەگەر خوەندەڤانێن مە یێن عەزیز، ل سەر ڤان کێماسی و ڤالاهییان مە ئاگاهدار بکن، بێگومان ئەمێ گەلەک کێفخوەش و دلشابن. چاوا تێ زانین نڤیسکار و خوەندەڤان گەلەکی هەوجەداری هەڤن، بێی هەڤ نکارن بژین.

**رۆهات**

**ستۆکهۆلم – ۱۹۹۳**

# ستوونەکە چیرۆکبێژییا کوردی

## خەلاسییا ژنان

دناڤ فۆلکلۆرا کوردی یا دەڤکی دە دەولەمەندیکە هەرە مەزن بێگومان چیرۆکن. چیرۆک بەشەکە فۆلکلۆرێ یە، نڤیسکارێن وان نەکڤشن، گەل ب خوە ئەڤ بەرهەمان ئەفراندییە. جارجار د وەشانێن پەرییۆدیک دە، چیرۆک ل شوونا سەرپێهاتییان (کورتە چیرۆک) ژی تێ ب کارئانین، لێ بەلێ ئەڤ یەکا نەراستە، ژ بەر کو نڤیسکارێن سەرپێهاتییان کڤشە، سەرپێهاتی بەرهەمێن نووژەنن. ب تەحر و ناڤەرۆکا خوە ڤە ژ چیرۆکان گەلەک جودا دبن، ئەڤ یەکا د وارێ ناڤکرنێ دە تەڤلهەڤیکە مەزن پەیدا دکە. جارجار ڤان هەردو بەرهەمان رە ژی چیرۆک تێ گۆتن. پێویستە ئەڤ پرسا تەرمنۆلگیییێ بێ چارەسەرکرن، هەر تشت د جیهێ خوە دە روونێ.

هەر چقاس هەتا نها چەند کۆللەکسیییۆن و بەرهڤۆکێن چیرۆکێن کوردی هاتنە وەشاندن ژی، مرۆڤ ئیرۆ نکارە بێژە کو پرانییا چیرۆکێن کوردی ئیرۆ دەرباسی سەر کاغز بوونە. بەدەوییا چیرۆکێن کوردی چاوا ئەم دبینن بالا گەلەک رۆهلاتناس و کوردناسان ژی کشاندییە سەرخوە، ژ ڤان چیرۆکان بەشەک ب زمانێ بیانی دەرچوونە، هاتنە وەرگەراندن[1]. دەما مرۆڤ ب چاڤەکی زانستی، رەخنەڤانی و لێکۆلینی ل چیرۆکێن کوردی مێزە دکە و بابەتێن وان ئانالیز، سافی دکە، مرۆڤ وێ چاخێ دبینە کو، ئەڤ بەرهەم، ئەفراندنێن گەلی، وەک دەستانێن کوردی. گۆتنێن پێشییی و سترانان ژ مە رە دەولەمەندیکە ژیینا فۆلکلۆریک پێشکێش دکن، ل مە شیرەتان دکن، رێ نیشانی مە ددن، مە د ناڤ فانتازیییێن رەنگین دە دهێلن، فانتازی،



خەون، خەونەرۆژێن سەد سالان د ناڤ ڤان چیرۆکان دە هەر چوونە دەولەمەند بوونە، بەشەک ژ وان ب راستییێن ژیینێ ڤە گیهشتنە هەڤ، ژ ئالییێ مرۆڤان دە تێگیهشتنا ژیینێ زێتر هێسانتر کرنە. دڤی واری چیرۆکێن کوردی گەلەک هینکار و شیرەتکارن. د ڤان چیرۆکان دە ل دژی بێگاڤی، نەچاری، تونەبوون و خزانییێ، چاوا ئەم دبینن ئیمکان و مەجالێن نەدیتی، نەبیهستی ژ ئالییێ مێرخاسێن چیرۆکی دە تێن ئەفراندن، د ناڤ ڤان بەرهەمان دە ئەو شەرێ پاکی - نەپاکی، قەنجی - خرابییێ، خوەشی - نەخوەشییێ هەر دچە تووژ دبە، هەر چقاس دلسار و رووسار بە ژی، داوییا بەشەک ڤان چیرۆکان جارجار ب مرن - کوشتنێ ڤە دقەدە. ئەو شەر - دەو، تەقەرەق، سەرپێهاتی، بوویەر و قەوماندنێن مەزن یێن کو د چیرۆکێن کوردی دە تێن پێشکێش کرن، ژ ئالیکی دە ژی وەک نەینکەکێ، ژانێن جڤاتێ، سەرئێشییێن جڤاتێ و رەوشا جڤاتێ نیشان ددن، پێوەندی و هەڤگرێدانێن مرۆڤێ رادخن بەر چاڤان. د چیرۆکێن کوردی دە گەلەک عرف - عەدەت، رێڤاچوون، کارەکتەر، نێرین و دیتنێن ل سەر ژیینێ هەنە، جڤاتێ ب رێکە هونەری، ئارتیستیک، ب ئالیکارییا زمانێ چیرۆکان ڤە داخوازی، هێڤی و خەونەرۆژێن خوە یێن سەد سالە ژ نووە ڤە جڤاتێ رە پێشکێش کریە. جڤاتێ ب درێژاهییا سالان، ب هەزاران چیرۆک ئافراندییە، ئانگۆری سال - زەمانان هەوجەدارییێن مە یێن هونەری ب جیە ئانییە، ئەم تێر کرنە، هونەرا چیرۆکبێژییا کوردی د ژیینا راستین دە نین بەژی، قەت نەبە ژ مە رە جیهانەکە چیرۆکی وەک خەلات هیشتییە، پێشکێش کرییە.

دەما ئەم ناڤەرۆکا چیرۆکبێژییا کوردی راچاڤ بکن، ئەم دبینن کو گەلەک بابەت و مۆتیڤێن ژ هەڤ جودا د ناڤ ڤان بەرهەمان دە جیە گرتنە،

ئەڤ دەولەمەندییا مۆتیفان نیشانی مە د دە، کو جڤات ژ هەر ئالییێن خوە
دە بوویە بابەتا چیرۆکان. ب کورتی مرۆڤ نکارە پەیڤێن چیرۆک و جڤاتێ
ژ هەڤ جودا بکە، بقەتینە.

د ناڤ چیرۆکێن کوردی دە مۆتیفەکە زێتر هاتیە ب کارئانین، بێگومان
رەوشا ژنانە، د ناڤ ڤان بەرهەمان دە بابەتا ژنان مۆتیفەکە هەرە رەنگینە،
ب تایبەتی خەلاسییا ژنان. ئەڤ چیرۆکێن کوردی، ژ سالێن کەڤنارە ڤردە
دەرهەقا رەوشا ژنان، جیهێ وان، بەرپرسیاری و ئەرکێن وان دە مە گەلەکێ
رۆنی دکن، چیرۆکبێژییا کوردی د ڤی واری دە چاڤکانیکە گەلەک ب
کێرهاتییە. ژ بۆ لێکۆلین و خەباتێن کو ل سەر ژنێن کورد تێن کرن، ئەڤ
چیرۆکان وەک سەرمایەکە مەزن د ڤی واری دە دکارن بێن حەسبین.

دەما ئەم ناڤەرۆکا ڤان چیرۆکان ب کووراهی هوور – هوور د کۆلین،
ئەم دبینن کو جڤاتا کوردی، تمێ روومەت و جیهەکی مەزن دایە ژنان، د
پێوەندیێن ژن – مێران دە، د وارێ مێرکرن – زەواجێ دە ژیان تمێ رۆلەکە
مەزن لیستنە. ژ ئالییێ دن جڤاتێ هەموو ژن نەخستییە تایەکی تەرازییێ،
ژنێن باش و ژنێن نەباش ئانگۆری نۆرمێن وان سال – زەمانان مێزە
کرییە. ژنێن باش رووسپی کرییە، ژنێن نەباش رووڕەش ، رووتەنی کریە.
جڤاتێ پیڤانێن باشی – نەباشییێ، ئانگۆری خێرا جڤاتێ، مالباتێ،
ئانگۆری خێرا زارۆکان و ئانگۆری خێرا خەلاسی، ئازادییا ژنان کڤش
کرییە. ژنێن باش، چاوا ئەم د داوییا چیرۆکان دە دبینن، خێر و خوەشی ل
سەر وان دە دبارە، ئەو ژ بەر دەستێ زۆردەستان خەلاس دبن، ئەو ئازاد
دبن، دفلتن، پرسا خەلاسییا ژنان د ناڤ چیرۆکێن کوردی دە بابەتەکە هەرە
بەرچاڤە. د داوییا هەر چیرۆکەکێ دە ئەو ب دلکەتییێن خوەڤە دبن یەک،
دچن دگهێژن مرازێ خوە، ب هەڤ شادبن. ژنێن نەباش ژی، د داوییا



چیرۆکێ دە گەلەک جاران جەزاییێن خوە دبینن و تێن کوشتن. دڤێ بابەتێ دە
هەر چیرۆکەکە کوردی مرۆڤ دکارە بێژە هەقی و عەدالەتێ بەلاڤ د بکە.

## وەلاتێ هات – نەهاتێ

دەما ئەم ئاڤاهی و هەڤسازییا چیرۆکێن کوردی مێزە دکن، گەلەک
جاران مێر دەما دخوازن بزەوجن، ژ خوە رە کەچەکێ بینن، ئەو خوە داڤێژن
ناڤ ئاگرێن مەزن، ژ بۆ ژنان جانێ خوە ددن، ترس –خۆفێ داڤێژن
ئالیکی. دەما مرۆڤ ل سەر ڤێ یەکێ هوور و کوور دفکرە، مرۆڤ دبینە
کو جڤاتێ ژن سەر هەر تشتی رە گرتنە. ئانگۆری دلکەتییێ مێرین، تو
دبێژی ژ ژنێ شرینتر تو تشتەکی شرین ل رووبارێ دنێ تونەیە، تمێ دبەزە
... ب سایا ڤان بەرهەمان مرۆڤ فێر دبە کو جڤاتێ قیمەتەکی چاوا مەزن
دایە ژنێ. ژ بۆ کو خوە بگهینن دلکەتییێن خوە ئان ژی «حوسل جەمال» و
«حوسل دەلال»ێن خوە، ئەو دچنە سەفەرێن دوور و درێژ، ئەو بەرێ خوە
ددن ئوخرێ و دنێ، پشتا خوە ددن فەلەکێ، تەرکەسەری، تەرکەسەلاتی
دنێ دبن، چۆل – چۆلستان، بەری – بەرستان ... ب دنیا دکەڤن، ئەڤ
بەزا، د داوییا هەر چیرۆکەکێ دە دبە خەلاسییا ژنەکە دیلگرتی، پەریشان
و نەهەقیکە مەزن لێبوویی، د چێرۆکێن کوردی دە ئەڤ کەچێن شەنگ و
شەپال ب ئیفادەێن گەلەک هێژا ڤە تێن پەسناندن. ئەڤ (حوسل جەمال)و
(حوسل دەلال)، ب تایبەتی کەچێن گەلەک جیوان و بەدەون، وەک
حۆرییانن .... دەما چاڤێ مرۆڤان ل وان دکەڤە، حەفت رۆژان نان – ئاڤ
نایێ بیرا مرۆڤان، نەبکە، نە بخوە، نەبدە، نەبستینە، بەدەوییا وان مێزە

بکە، رۆیێ رە دبێژن دەرنەکەڤە، ئەمێ دەرێن، ب دلەکی نا، هەزار دلی مرۆڤ دبە ئەڤینداریێ وان، ئەو جارجار وەک هیڤێن چاردەشەڤینە، وەک لەمپان دشوغلن ... ئانگوری چیرۆکێن کوردی، مێرێن بەنگین ژ بۆ ڤان جانکان، زەرییان دکەڤنە رییا وەلاتێ هات – نەهاتێ، وەلاتێ چوون – نەهاتێ. ژ بەر ئەڤ مەنزیلا کو ڤان کەسان دانە پێش خوە، ب تەنگاسی، دژواری و ب دەرد – کولان ڤە تژی یە، ڤەگەرا وان ئەوقاس نە هێسایە. ژ بۆ ڤێ یەکێ ژی ناڤێ ڤی وەلاتی، دانینە «وەلاتێ هات – نەهاتێ». ئەو کەسێن دچن دەردکەڤنا وەلاتێ دێوان، جنان، جانپۆلاتان، تەلووکەیێن مەزن ل پێشبەری وان هەنە، مرۆڤ گاڤێن خوە ب پیڤان و ب فەسال نەڤێژە، مرۆڤ دکارە ببە کەڤر ژی... گەلەگ جاران ئەڤ رێ، وەک رییا مرنێ تێ حەسبین، دچن دەردکەڤنە ل پاش چیاییێ قاف، دچن وەلاتێ چین – ماچینێ، ل گەلەک وەلاتێن چیرۆکی دگەرن. ئەو دچن ل دنیاییێ دگەرن، ژ ڤێ رێویتیییێ رە دبێژن «سەیرانگا دنێ»، «دەورا دنێ»، ئەو رووبارێ دنێ سەرۆ – بنۆ دکن د ڤێ رێویتیییا دوور و درێژ دە، ئەو جارنا راستی «دەستەبراک»ان ژی تێن، ئاقل و جەسارەت ددنە هەڤ، دچن دگهێژنە مەنزیلا خوە. د دەستپێکێ دە مرۆڤ د کارە بێژە، ئەو کەرێن شەیتین سییار دبن، دێ – باڤێن وان ژی جارنا ناخوازن لاوێن وان دەرکەڤن، هەرن ژ بۆ «پۆرسەرەکێ» و «کەڤنە ژنەکێ» تەرکەسەری دنێ بن. دەما ئەم داوییا چیرۆکان دنێرن، قەت ژی وسان دەرناکەڤە، هەرچقاس ئەو گەلەک چەتنایان، دژوارییان دبینن ژی، د داوییا چیرۆکان دە، ئەو وەک بووک – زاڤا، ب سەرفرازی جۆت ڤەدگەرن مالێن خوە و ب مرازێ خوە شا دبن.

ئەو مێرێن کو دچن ڤێ سەفەرا زەواجێ، چاوا ئەم ژ چیرۆکان فام دکن گەلەک فەلاکەت، بەلا تێن سەرێ وان و جەفاییێن گران دبینن، مەجبوور



دبن دکەڤن گەلەک دلڤان، گەلەک «کنج»ێن جودا خوە دکن. ئەڤ بەشا تەقەرەڤێ، د چیرۆکان دە بەشا هەرە بنگەهین دکارە بێ حەسبین. لێ بەلێ ئەو ژ هەڤێ هەموو ڤان دژوارییان دە دەردکەڤن، دبن خوەشمێر و جەنگاوەرێن بناڤ و دەنگ. ئەو نایێن کوشتن. د چیرۆکا هەرزەمێ قۆلان دە، هەرزەمێ قۆلان، دچە هەم خووشکا خوە، هەم ژی هەرسێ برایێ خوە رزگار دکە، تینە. ژ ئالیییێ دن زۆرا گەلەک هێزێن مایێن، ژی دبە، ئاگر ل بەر چاڤێ وی دپەکە، د داوییێ دە ژ خوە رە خووشکا دنیاییێ تینە[٢]. مێرخاسێ یەکەمین تمێ پێشەنگییا برایان، دەستەبراکان دکە. لێ مخابن، د داوییا چەند چیرۆکان دە ژ ترسان، ژ چاڤنەبارییێ و ژ بەر چەند سەدەمێن مایین، ئەڤ کەسانا بێبەختیکێ تیننە سەرێ مێرخاسێ چیرۆکێ یێ یەکەمین، مەتۆدێ هەری ناس، وی داڤێژنە بیرەکێ. لێ بەلێ ئەو رێکێ دبینە، دفلتە و حەیفا خوە ژ وان کەسێن بێبەخت دستینە.[٣] کەسێن وی خەلاس دکن، ب تایبەتی کۆچێن بازرگانانن.

## کەچێن پادیشاهان

د ناڤ ڤان کەسێن کو تەرکەسەری دنێ دبن وەکی کەچەکێ ژ خوە رە ببینن، ب وێ رە بزەوجن، گەلەک کەسێن شڤان، گاڤان، کەسێن بەلەنگاز و خزان هەنە، پرانییا وان هەول ددن، ب کەچا پادیشاه و پاشان رە بزەوجن. ژ بەر ڤان بێگاڤێ و نەچارییان، د ناڤ چیرۆکێن کوردی دە چیرۆکێن کو ل سەر پادیشاه، پاشان و حاکمان جیهەکی فرەه دگرن. چما پادیشاه، پاشا و حاکم؟ ب ڤان کەچێن باڤ – دەولەمەند رە زەواج، وەک

ڕێکە خەلاسییێ هاتییە دیتن، ئەو دخوازن ژ وێ بەلەنگازییا کو ئەو دناڤ دە نن، زووترێ خەلاس ببن، ببن زاڤێ کەسێن دەولەمەند، پشتا خوە خورت بکن، هەرچقاس ئەڤ کارەکی دژوار و چەتن بە ژی، دیسا ژی ئەو دچن ئان ژی کەسێن مایین دشینن خوازگینییێ کەچێن پادیشاهان. ژ ئالییێ دن مۆتیفا بەلەنگاز و پادیشاه وەک دژایەتیکێ د چیرۆکێ دە کەلەجانی و مەراقەکە مەزن پەیدادکە. ئەو دچن دۆزا مرۆڤاتییێ ل پادیشاه دکن. چاوا ئەم د چیرۆکێن کوردی دە دبینن، د وان سالێن کەڤن دە، کەسەکێ کو بچوویا خوازگینی، بەرێ د چوو ل بەر قۆناخا پادیشاه ل جیهەکی تایبەتی روودنشت، ژ ڤێ جیهی رە دگۆتن «کورسییێ خوازگینی». د چەند چیرۆکێن مایین دە ژی، ژێ رە «تەختێ خوازگینی» ، «کەڤرێ خوازگینی» هاتییە گۆتن. ئەڤ کورسی زێرکری بوویە. ئەڤ کورسییێ زێرکری تەنێ بۆنا کەسێن تێن خوازگینی، هاتییە سازکرن. کورسیکی زیڤکری ژی هەیە، ئەڤ کورسی ژی تەنێ بۆنا داخوازییێن مایین هاتیە چێکرن. زەنگلەک ژی ل بەر ڤی کورسیی هەبوویە، ب ئالیکارییا ڤی زەنگلی ڤە پادیشاه ئاگاهدار دبوو وەکی خوازگینییێ کەچا وی هاتنە.

دەما کەسەکی بەلەنگاز هەرە ل پادیشاه دۆزا مرۆڤاتییێ بکە، پادیشاه چەند مەرجێن «قەول، هۆی، شەرت» نەدیتی، نەبیهیستی و عەجێب پێشبەری ڤان کەسان داتینە، چاوا دبێژن «نەمن دیتییە، نە ژی تو ببیسە!» ، ئەوقاس مەرجێن گران بوونە. ئەڤ مەرجان دوان سالان دە ل شونا قەلەند هاتییە حەسبین. ب جیهئانین، پێکئانین و قەداندنا ڤان مەرجان، کارێن مرۆڤان نینە، وەک میسال د چیرۆکەکێ دە کەسێ چوویە خوازگینی پێویستە تۆنە گەنم و چەهێ تەڤلهەڤکری ژ هەڤ دەرینە، ژ بەر ڤێ نەچارییێ، ئەو دچە ل بال کورێ پادیشاهێ مووریيان، ژ وی



ئالیکارییێ هێڤی دکە.[٤] ئەگەر ئەڤ کەس داخوازییێن پادیشاه نەقەدینن، ئانگوری چیرۆکان، پادیشاه سەرێ وان ژێ دکە. ژ بەر ڤان کارێن گران، کەسێن دچن خوازگینییێ کەچێن پادیشاه، خوە داڤێژنە ل بەر بەختێ هێزێن مایین، وەک پیران، دێو، هووت، کەچا پادیشاه، حاجەتێن تلسمی، وەک شڤا قودرەتێ ... دەما داخوازییێن پادیشاه ب جیه تێن، پادیشاه ئێدی پێویستە کەچا خوە بدە وی کەسی.

د ڤان چیرۆکان دە تشتەکێ بالکێش ژی، ل هەمبەری ڤان سەرهشکی و مەرجێن پادیشاه، کەچێن کو تمێ قەنجی و خواشییێ دخوازن، ئەو د رییا باڤێ خوە دە نامەشن، گەلەک جاران ژی دخوازن ئالیکارییا وان کەسێن کو هاتنە خوازگینی، بکن. ئەڤ کەچان، ب ڤی تەحری وان مەرجێن کو باڤێن وان پێشتا دکشینن، ژێ رە چارەکێ دبینن، هێسانتر دکن. د داوییا چیرۆکان دە چاوا ئەم دبینن، ئەو دگهێژن بەخت و مرازێن خوە. ئەڤ کەچێن پادیشاه ب زانین و ب چاڤەکی مایین ل دۆر بەرێ خوە، ل بوویەران و ل دنێ دنێرن، گەلەک جاران یان خوە دکن. ئەڤ دژایەتییا پادیشاه - کەچا پادیشاه ناڤ و دەنگە.

وەک کەچا پادیشاه، وسان ژی چاوا ئەم د چەند چیرۆکێن کوردی دە دبینن، کورێ پادیشاه یێ پچووک تمێ د رێکە قەنج دە دمەشە، مێرخاسە، فەداکار، راستگۆ و جامێرە. د چەند چیرۆکێن کوردی دە وەک گەلەک جاران تێ دوبارەکرن، ب تایبەتی سێ کورێ پادیشاه هەنە، ناڤێ یێ پچووک گەلەک جاران میرزە مەحموود ئان ژی میرزە محەمەدە. ژ بەر کو ئەو تمێ د رێکە راست دە دمەشن، ب قەنجی، ب مێرخاسییا خوە ڤە تێن ناسین، پەیڤا «میرزە» ژی، وسان تێ باوەرکرن کو ژ ئالییێ جڤاتێ دە ب زانەتی ل سەر ناڤێن وان کەسان دە هاتییە زێدەکرن، د ناڤ چیرۆکێن

کوردی دە گەلەک چیرۆکێن ل سەر میرزە مەحموودە و میرزە محەمەمەد هاتنە گۆتن، هەنە. ئەڤ هەردوو کەس وەک دو مێرخاسێن چیرۆکی یێن هەرە ناڤدار تێن ب ناسکرن، ئەو خەلاسکارێن ژنێن بندەستن.

میرزە مەحموود د گەلەک چیرۆکان دە تەرکەسەری دنێ دبە، دچە دکەڤە ناڤ گەلەک شەڕ – دەوێن مەزن، ژ خوە رە کەچەکە بەدەو پەیدا دکە، تینە. ژ بەر کو مێرخاس، جامێرە، گەلەک کەچک تمێ ل سەر وی بەنگی دمینن. دەما ئەو ب کەچەکە مایین رە مەجبوور بمینە، رازێ، ئەو شووریێ خوە داتینە ناڤبەرا خوە و وێ، ئەڤ یەکا ژی، حەلالی، پاقژی و دلۆڤانییا میرزە مەحموود نیشان ددە. ئەڤ شوور دبە نیشانا حەلالییێ.

## چەمبەرا دۆرا ژنان تەنگ دبە

ژ دەر کەچ وکوڕێ پادیشاه، ڤێ جارێ پادیشاه ب خوە ژی دخوازە بزەوجە. جارجار ژی، چاڤ بەر ددە ژنێن خەلکێ، دخوازە ب ژنێن مایین رە سەرێ خوە بکەیەک. هەر چقاس ئەو پادیشاه بە ژی، چاوا ئەم د چەند چیرۆکان دە ژی دبینن، کارێ پەیداکرنا یارەکێ ئەوقاس هێسا نینە. گەلەک جاران ئەو ژ وەزیرێ خوە ئالیکارییێ دبینە، وەزیر دشینە ل بال ژنان. د داوییا ڤان چیرۆکان دە چاوا ئەم دبینن، ژ بەر فامداری، هش و دووردیتنییا ژنان، ئەڤ پادیشاه ب هێسانی ناگهێژن داخوازێن خوە، لنگێ خوە دکن سۆلەکە تەنگ و دەستێ خوە دکن قوولا مار. د چیرۆکا بناڤێ ژن و پادشا دە، دلێ پادیشاهەکی دکەڤە ژنەکە مێرکری. مێرێ ژنکێ لەشکەرییا خوە دکە. پادیشاه دخوازە ب دەک – دۆلاڤ، ب فەند – فێلان ڤە هەم ژنێ، هەم ژی مێرێ وێ بخاپینە. لێ دەما مێزە دکە کو ژنک نایێ رایێ، ناخوازە ب وی رە رازێ، د داوییێ دە هەم ژنکێ، هەم ژی مێرێ وێ دکوژە [٥]. ئەو حەلالییا کو د ناڤبەرا ژن – مێر دە هەیە، دبە کاکلێ ناڤەرۆکا گەلەک چیرۆکان. د چیرۆکا (ژنا وەزیر یا ئاقل) دە ژی پادیشاه ناگهێژە داخوازا خوە. دەما پادیشاه مێزە دکە، وەزیر نەماڵە، دچە مالا وی، چەند گلییان بەر ژنکێ رە داڤێژە، ژنک نێتا وی فام دکە، ژنک چەند هێکان ب رەنگێن جودا بۆیاخ دکە، داتینە پێش پادیشاه. پاشێ ژ پادیشاه دپرسە وەکی تاما کیژان هێکێ زێدەیە، دەما پادیشاه دبێژە تاما هەموویان وەک هەڤە، وێ چاخێ ژنک نێتا پادیشاه ددە روویێ وی، دبێژە ژن ژی هەموو وەک هەڤن، ب سەرگرتی دبێژە کو، دەست ژ من بەردە، ژن وەک ڤان هێکان هەموو یەکن [٦]. ژ بەر ڤێ بەرسیڤا ژنکێ، ئێدی ژ دەستێ پادیشاه تشتەک نایێ، پادیشاه ب پۆشمانی پاشتا ڤەدگەرە، دچە قۆناخا خوە. د هەموو ڤان چیرۆکێن ڤی تەحری دە ژی چاوا تێ خویان، مال – ملک، دەولەمەندی، پەرە – پوول ئەوقاس نەگرنگن، پێوەندییێن مرۆڤی، حەلالی، راستی و پاکی تێ دڤان چیرۆکان دە سەردکەڤن.

گەلەک چیرۆکێن کوردی ژی، ل سەر مەلایان هاتنە گۆتن. د ڤان چیرۆکان دە پێوەندییێن مەلان و ژنان جیهەکی فرەھ دگرن. ژ ڤان چیرۆکان گەلەک کورتن و وەک پێکەنۆکان هاتنە گۆتن. جڤاتێ ب مەلان قرف و تناز کرنە، ب ئالیکارییا ڤان چیرۆکان ئەو رەخنە کرنە، بەرپرسیارییا وان ئانییە بیرا وان. چاوا تێ زانین د جڤاتا کوردی دە، ژ بەر ئۆلێ ئیسلامییێ جڤاتێ تمێ باوەرییا خوە ب مەلان ئانینە، جیھ و روومەتەکە مەزن دانە وان. مەلان ژی، ئەڤ باوەرییا خەلکێ گەلەک جاران بەدکار کرنە. د چیرۆکا گولێ و چووکۆ دە، ل سەر کانییێ ژنا مەلە تمێ دکەڤە دۆرا پێش،

ژنا گاڤێن ژ ڤێ یەکی عاجز دبە، گازنان ل مێرێ خوە دکە، ژنک دخوازە
مێرێ وێ ژی ببە مەلە. گاڤان کنجێن مەلان خوە دکە، تەرکەسەری دنێ
دبە، بوویەرێن مەزن تێن سەرێ وی، دچە سەرحەدێ ناڤێ وی گەلەکی
بەلاڤ دبە، گاڤان دبە مەلاکی ناڤدار، ژنا وی ژی دبە ژن سەیدا.[٧] چاوا
ئەم د چەند چیرۆکان دە دبینن، چاڤێن مەلان تمێ ل ژنێن کەسێن مایینن،
چاڤێ وان تمێ ل دەرن. گەلەک جاران خوە ڤەدشێرن، ب ڤی تەحری
دخوازن نێزیکی ژنان بن، د چیرۆکا (تەرزی) دە چاوا ئەم دبینن کو، ئەو،
ژنا تەرزیکی ژ رێ دەردخە، ب وێ رە دکەڤە کێفێ[٨]. هەر چقاس
ناخوازن ژنێن وان هەرن ناڤ کۆما مێران، لێ بەلێ ئەو ب خوە تمێ دخوازن
ب ژنێن مایین رە بمینن، دەما داخوازێن وان نایێن جیە، چاوا ئەم د
چیرۆکێن (کەچەلۆک و قیزکا ئامووتام) دە ژی دبینن، ئەو دکارن شەڕان
ژی باڤێژن ژنان، ناڤێن وان خراب بکن[٩]. د چەند چیرۆکان دە ژی، مەلا
زانینێن خوە یێن ئۆلی بکار تینن، ب ئالیکارییا دوعایان دخوازن ژنان ژ
رێ دەرخن، د داوییێ دە دبن بابەتێن پێکەنۆکان، دەما مەلەک قالا
حۆرییان دکە، پێرەژنەک ژی دەرهەقا «حۆرییێن نێر» دە ژ مەلە
ئاگاداریان هێڤی دکە[١٠]. ب کورتی تەما مەلەیێن ژنباز د ناڤ
چیرۆکێن کوردی دە تەماکە گەلەک بەلاڤ بوویی و ناڤدارە.

مێرێن کومرەش (حەسوود، بەهەجۆک، دەخەس، چاڤرەش، چاڤنەبار)
گەلەک جاران دبن سەدەمێ مالوێرانییێ و تووژبوونا پێوەندییێن ژن -
مێرێن کومرەش تمێ وەک ناخواشیکێ شکێ دبنە ژنێن خوە. بابەتێن چەند
چیرۆکێن کوردی ل سەر بنگەهێن کومرەشیێ ئاڤابوونە، کومرەشی بوویە
بابەتا پێکەنۆکان، چیرۆکان، مێر د ڤان چیرۆکان دە تێن رەخنەکرن. ژنێن
شیرحەلال، دلپاک تمێ دڤان چیرۆکان دە رووسپی دەردکەڤن. د چیرۆکا



(کو مەرڤ بخواز) دە سەرپێهاتییا مرۆڤەکی کومرەش هەیە، ئەو تمێ ژنا
خوە پێکۆل دکە، ئەو دچە کیدەرێ، مێر ددە پەی، ئەو هەتا ئاڤدێستخانێ
ژی ددە پەی ژنا خوە[١١]. د چیرۆکا (چاڤرەش لنگان دوەشینە) دە، دەما
کەسەک دبە مێڤانێ مالێ، باویشکێن وی تێن، مێرێ ژنکێ ڤێ یەکێ
وەک نیشانا پێوەندییێن ژنا خوە و مێڤانێ مالێ دحەسبینە، شکێ دبە
باویشکێن مێڤان. ژنا خوە ب کێرانێ حەوشێ ڤە دادلەقینە. لێ بەلێ،
پاشێ دەما ئەو دنێرە باویشکێن مێڤان بەردەوامن، ئارمانج نە ژنە، ئەو ژ
کرنێن خوە پۆشمان دبە[١٢].

## مۆتیفا «کەچا عاقل»

د ناڤ بەشەک چیرۆکێن کوردی دە ئەم راستی ژنێن زانە، فەمدار،
خەباتحەز، قەنج، حەلال و راستگۆتێن. ئەو تمێ د ڤان چیرۆکان دە تێن
پەسناندن، د گەلەک رۆژێن تەنگ و دژوار دە دبن کلیتا سەرێ مێرێن خوە،
رێبێن قەنجییێ و خێرێ داتینن لە بەر مێران. مێرێن ترال، بێکێر، مێرێن
کو تمێ د مال روودنێن و کار ناکن، چاوا ئەم دبینن ژ ئالییێ ژنێن خوە دە
تێن رەخنەکرن. ئەڤ مێرێن ترال جارجار دبن بابەتێن پێکەنۆکان. د
داوییێ دە ژنێن ڤان کەسێن ترال، مێرێن خوە داڤێژن بەردێری، ئەو
تەرکەسەری دنێ دبن، دچن تەڤی ناڤ بوویەر، تەقەرەق و گەلەک
قەوماندنان دبن. د چیرۆکا (تەلۆیێ نەوێرەک)دە، مێرەکی وسان ترسۆنەک
هەیە، تمێ ل مالە، نەوێرە دەرکەڤە دەرڤا. رۆژەکێ ژنا وی مێزە دکە، ئێدی
ئەڤ یەکا ئاوا نامەشە، لیستکەکێ تینە سەرێ وی. ژنک دچە دەرڤا
کاتان ل بەر دێری رادخە، دبێژە عەلۆ هەلا رابە کاتە بارینە. دەما عەلۆ
رادبە، دچە دێری ڤەدکە، ل کاتان مێزە دکە، ژنا وی، تینەوی نشکێڤا

دەف ددە، دێری دگرە، جارکە دن ڤەناکە. پاشێ عەلۆ نەچار دمینە، دچە دەردکەڤە وەلاتێن دوور، دبە دۆستێ دێوان، دەولەمەند دبە، ڤەدگەرە تێ مالا خوە[١٣]. چیرۆکەکە کو نێزیکی بابەتا ڤێ چیرۆکێ یە، چیرۆکا (سلێمانێ نەوێرەک)ە[١٤]. د چیرۆکا (میرێ شەڤێ) دە ژی، مێرەکی ئاوا شل – شێت هەیە. ژنا وی رۆژەکێ دبێژێ، دبێژە رابە شەڕ دەرکەتییە، تو چما د مال دە روونشتی، پێلی دامارا وی یا مێرانییێ دکە. مێر مەجبوور دمینە رادبە شوور – مەرتالێ خوە هلددە دچە ناڤا گوند، لێ بەلێ چ شەڕ، چ حال! پاشێ دەما مێرێک ڤەدگەرە تێ مالا خوە ژنک دێری لێ ڤەناکە دبێژە مێرێ من چوویە شەڕ، خوە نەزانییێ داتینە. ب کورتی چیرۆک پاشێ وەک پێکەنۆکەکێ بەردەوام دکە[١٥]. وەک ڤان چیرۆکان، د چەند چیرۆکێن مایین دە ژی، ئانگۆری مێران، ئەم راستی ئاکتیفبوونا ژنان تێن. مێرێن کو دبن باعیسێ مالوێرانییێ و کامباخییا مالێ، تمێ تێن رەخنەکرن، ژن ژی وەک ستوونا مالێ تێن پەسناندن.

مۆتیفا «کەچا ئاقل» د چیرۆکێن کوردی دە، مۆتیفەکە بنگەهینە. گەلەک جاران ب فامداری، ب زانین، ب سەروەختبوونا خوە ڤە، کەچ – ژن زۆرا مێران دبن، ئیفادا «دە دیسا شوغل ژ ئالییێ ژنان دە چێ دبە!» هنەکی ژی، ل سەر ڤان باوەرییان ئاڤا دبە. د چیرۆکا (باڤ و کوڕ)دە، ژ هێرسێ کوران یەک هەرامزا (پیچ) ـە، دەما کوڕ دچنە بال مەلاکی وەکی هین بن، ژوان کیژان هەرامزایە، مەلا نکارە ژێ دەرخە، کەچا وی تێ هاوارییێ، پشتی چەند پرسیاران کوڕێ هەرامزا تێ کفش کرن[١٦]. د چیرۆکا (قیزا سەروەخت)دە، سەرپێهاتییا کەچەکە زانە و فامدار هەیە. پشتی گەلەک چەتنایان ئەو دبە پادیشاه، تەیرێ دەولەتێ سەرێ وێ روودنێ[١٧]. تەیرێ دەولەتێ، بێگومان ژ بەر سەروەختییا ڤێ کەچکێ تێ



سەرێ وێ روودنێ، وەک خەلاتەکێ مرۆڤ دکارە بحەسبینە، ب گۆتنەکە مایین ب ڤێ مۆتیفا تەیرێ دەولەتێ، جڤات ڤێ کەچکێ پیرۆز دکە. د چیرۆکا (بووکا ئاقل)دە، ڤێ جارێ بووکەک تینە یەک – یەک گازی بیست کەسان دکە، سێڤەکێ دخە جێبێن وان، هەریەکی رە ژی دبێژە «ئەز تە حەز دکم». پشتی ئەڤ هەموو بیست کەس دچن ژ ڤێ بووکێ رە پالەتییێ دکن، ئەو دبێژە «دە بخەبتن، ئەز حەیرانا خۆرتێ سێڤ جێبێ دە». ژ بەر کو سێڤ جێبا هەرکەسی دە هەبوویە، هەموو ب خێرەتەکە مەزن ڤە کار دکن، کار زووترێ دقەدینن[١٨]. د چیرۆکەکە مایین دە، پادیشاهەک دخوازە کوڕێ خوە بزەوجینە، دلێ کوڕ دکەڤە کەچا گوندییەکی. جارا پێشین، مالباتا پادیشاه ناخوازە ببن خزمانییێ مالا کەچێن گوندییان. لێ بەلێ پادیشاه دەما سەروەختییا کەچکێ دبینە، وێ چاخێ ئێدی بێگاڤ دمینە، بڕیارێ خوە دگوهرینە[١٩].

## کۆمێن ژنێن خراب

دناڤ چیرۆکێن کوردی دە ئەم راستی ژنێن وسان تێن کو ب خرابییا خوەڤە هاتنە ناسین، وەک دامارى، خاسی، هێوی، ژنتی، داییکێن بێ باڤ ودلبکەڤر ... ژ ڤان ژنان گەلەک د داوییا چیرۆکان دە جەزایێ خوە دبینن و تێن کوشتن.

د ناڤ چیرۆکێن کوردی مۆتیفەکە هەرە ناسکری و مەزن ژی مۆتیفا دامارییانە، د ڤان چیرۆکان دە، رەوشا ڤان زارۆکێن کو د یێن وان دمرن، دکەڤن بەردەستێ دامارییان هەر دچن بەر ب نەپاکی و خرابییێ دچە. دلهشکییا دامارییان تو سێنوران ناس ناکە. گەلەک جاران دکەڤن بن

مێرێن خوە، زارۆکان و باڤێن وان بەری هەڤ ددن، زارۆکان ل بەر چاڤێ باڤان رەش دکەن. جارجار باڤ دبن باندوور و گۆتنێن ڤان ژنان دە ژی دمینن، وی چاخێ ئێدی ژ ڤان زارۆکان رە تو ستارەک نامینە. ئەو تمێ لێدان، کوتان، کۆتەکان دبینن، تی - برچی دمینن، ب ترس - خۆڤەکە مەزن ڤە دژین. د داوییا ڤان چیرۆکان دە، داماری ئالییێ جڤاتێ دە، تێن گونەهکارکرن و جەزایێن مەزن دبینن. د چیرۆکا (توودی قوشی) دە، داماریکە وسان دلکەڤر ژ ئالییێ زارۆکان دە تێ کوشتن و جەزایێ خوە دبینە. ئانگوری چیرۆکێ دو زارۆکێن کەسەکی گەلەک دەولەمەند هەبوونە. باڤێ وان رۆژەکێ لێدەخە دچە حەج. ئەو هەردو زارۆکێن خوە ل بەر دەستێ ڤێ ژنا خوە یا دووەمین دهێلە ئەڤ ژن، دەما مێرێ وێ دچە حەج، ژ خوە رە دۆستەکی نووه دبینە، ب وی رە رۆژێن خوە دەرباس دکە. ئەڤ دۆستێ وێ دخوازە وەکی ژنک ڤان زارۆکان بکوژە، سەرێ وان ژێ بکە. لێ بەلێ جارییەکە ڤێ مالێ هەبوویە. ئەو، زارۆکان ژ ڤێ یەکێ ئاگاهدار دکە، زارۆک ژی سەرێ خوە هلددن دچن جیهەکێ دوور. پشتی کو مێرێ ژنکێ ژ حەج ڤەدگەرە، قالا کورێن خوە دکە، ژنک دبێژە کو زارۆک مرنە. چەند سال دەرباس دبن، رۆژەکێ ئەڤ زارۆک دخوازن وەک مێڤانی هەرن سەریکی بدن مالا باڤێ خوە، هەلا کا رەوشا وان چاوایە. ئەو ژ باڤێ خوە رە بەحسا چیرۆکەکێ دکن، بابەتا چیرۆکێ هەما سەرپێهاتییا وان ب خوەیە. وێ چاخێ باڤ فام دکە کو ئەڤ کەسان زارۆکێن وی ب خوەنە، تشت ئێدی زەلال دبە. داماریێ دکوژن، وێ جاریێ ژی ددنە باڤێ خوە. د گەلەک چیرۆکێن کوردی دە، پشتی خەرابیکێ گەلەک سال دەرباس دبن، ئەو مێرخاسێن کو ژ مالەکێ نە و بە سالان ژ هەڤ دوور کەتنە، دناڤ چیرۆکێ دە بەحسا چیرۆکەکێ دکن (چیرۆکا ژیینا خوە) دکن، ئەڤ چیرۆکا



سەربۆرییا وان ب خوەیە. پشتی ڤێ «چیرۆکا ناڤ چیرۆکێ» هەرتشت دەردکەڤە هۆلێ، ب ڤی تەحری ئیمکانا زانین و هینبوونا کەسێن خراب پەیدا دبە[٢٠]. ئەڤ «چیرۆکا ناڤ چیرۆکێ» د چەند چیرۆکێن مایین دە ژی وەک ستیلەکێ، خەملەکی تێ ب کار ئانین، ژ بۆ زەلالبوونا مەساژا چیرۆکێ ئیمکانەکە مەزن پەیدا دکە. د چیرۆکا (عەلیک و فاتک) دە ژی دیسا ئێش و ژانا داماریان تێ پێشکێش کرن. ئەڤ چیرۆکا، چیرۆکەکە گەلەک ناسکری و حەزکری یە، ل گەلەک دەڤەرێن کوردستانێ بەلاڤ بوویە، عەلیک و فاتک ناڤێ برا و خووشکەکێ یە، پشتی دییا وان دمرە، ئەو دبن سێوی، ستووخار ل بەر دیوارا دمینن. دەما دییا وان دمرە، باڤ ژ نووه ڤە دزەوجە، ژ خوە رە ژنەکێ تینە. ئەڤ ژنباڤ کەسەکە نە باش بوویە، تمێ ب چاڤەکی خراب ل ڤان زارۆکان مێزە کرییە. رۆژەکێ دامارییا ڤان زارۆکان، وان دشینە چۆلێ وەکی ژ وێ رە کەرەنگان بەرەڤ بکن، بینن، بنێ توورکێ وان ژی قوول بوویە، چ کەرەنگێن بەرهەڤ دکن، ژ ڤێ قوولرکا توورکێن وان دە تێ خارێ، نکارن توو کەرەنگان بدن هەڤ. ئەو گەلەک دوەستن، تی - برچی و بێخەو دمینن، رییا خوە دکن و گەلەک تشتێن نەباش تێن سەرێ وان، د داوییا چیرۆکێ دە ژ وان هەریەک ژ خوە رە دزەوجە، دگهێژە مرازی خوە[٢١]. بناڤێ (پەپووک) ژ ئالییێ ناڤەرۆکا خوەدە گەلەکی نێزیکی چیرۆکا عەلیک و فاتکە. دەما ئەو دچن ژ دامارییا خوە رە کەرەنگان بەرهەڤ بکەن. چاوا مە ل ژۆر ژی گۆت ژ بەر کو توورکێ وان قوولک بوویە، ئیمکانا بەرەڤکرنا کەرەنگان تونە بوویە، زارۆک ژی نزانن وەکی دامارییا وان بزانەتی توورکەکی قوول دایە وان. ڤێ جارێ خووشک شکێ دبە برایێ خوە، ئەو هەو دزانە، هەما برایێ وێ هەموو کەرەنگێن بەرهەڤکری دخوە، جارەکێ خەلاس دکە، نزانە کو توورک قوولە.

ژ بەر ڤێ یەکێ ژی، ئەو دکەڤنە قرکا هەڤ، ب هەڤرا شەڕ دکن. ئانگۆری چیرۆکێ، رۆژەکێ خووشکا لاوک تینە زکێ برایی خوە دقەلشینە. دخوازە مێزە بکە کو هەلا کا کەرەنگ هەنە ئان نا. د داوییێ دە دبینە کو، تو کەرەنگ دزکێ برایێ وێ دە تونەنە، ڤێ جارێ گەلەک لەبەر خوە دکەڤە، دوعایان ل خوەدێ دکە وەکی وێ بکە پەپووک، خوەدێ داخوازا کەچکێ تینە جیه، وێ دکە پەپووکەکێ[22]. گەلەک شاخ و گوهارتۆکێن سەرپێهاتییا ڤان خووشک و برا هەنە، بەشا داوین یا هەر شاخەکێ ژی، ئانگۆری هەر چیرۆکبێژ و دەڤەرێ ژ هەڤ جودا دبە. ل سەر بابەتا داماریبیان چیرۆکەکە هەرە بالکێش ژی چیرۆکا بناڤێ (سووربیبە یار)ە. ئانگۆری ڤێ چیرۆکێ، سێ کەچێن مرۆڤەکی هەبوونە، پشتی چەند سالان دییا وان دمرە. بەری کو دییا وان ب مرە، ئەو ژ مێرێ خوە هێڤی دکە، دبێژە مێرێ خوە، دبێژە دەما ئەز مرم، تە ژنەکە تەزە ئانی، نەهێلە ئەو ژن ب دەستێ خوە ڤە زارۆکێن من بخە، دەستەکی من ژێ بکە، دەما وێ خواست زارۆکان بخە، برا ب ڤی دەستێ من ڤە لێخە. ژنا وی دمرە. ژنا تەزە، ئانگۆ داماری دبێژە مێرێ خوە، دڤێ تو ڤان زارۆکان ببی سەرێ چییاکی بکوژی. مێرێ وێ هەر چقاس ڤێ یەکێ ناخوازە، رۆژەکی مەجبوور دمینە، وان دبە سەرێ چییاکی دهێلە، تێ ژنا خوە دخاپینە، دبێژە من زارۆک کوشتن، ب ڤی تەحری، ئەڤ هەر سێ زارۆک ژ بەر دەستێ داماریبێ دفلتن. پشتی چەند سالان ژ وان کەچان یەک ب کورێ پاشاکی رە دزەوجە، خووشکێن خوە ل بال خوە جیواردکە، باڤێ خوە ژی، عەفوو دکە، پاشێ هەموو د ناڤ خوەشییێ دە دژین[23].

چاوا تێ خویان بێباڤییا داماریبیان د ناڤ چیرۆکێن کوردی دە، وسان ژی د ناڤ بەرهەمێن مایین دە مۆتیڤەکە ناڤ و دەنگە، وەک میسال



گەلەک گۆتنێن پێشیا هەنە کو ل سەر داماریبیان و زۆردەستییێن وان یێن ل دژی زارۆکان هەنە.

ژ دەر ژانا داماریبیان، مۆتیڤەکە «ژنا خراب» یا مایین ژی ژانا خاسییانە. خاسی ژی وەک داماریبیان گەلەک جاران ب دلهشکی، بێوجدانێ و ب نەهەقییا خوەڤە هاتنە ناسین. د چیرۆکا (بووکا گول سوون) دە، خاسیکە وسان بێ ئیمان و بێ باڤ هەیە. رۆژەکێ لاوکەک دزەوجە، ژ خوە رە کەچەکێ تینە. دییا لاوک ژی، ب وان رە تەڤایی د مالێ دە دمینە. دەما کورک دچە ل سەر کارێ خوە، ئەڤ بووکا تەزە و خاسییا خوە تەنێ دمینن. خاسی گەلەک جاران خوارنێ نادە بووکا خوە، وێ برچی دهێلە، ب وێ رە پەڤ دچە، رەوشا بووکێ هەر دچە خراب دبە. بووکەکە بێدەنگ، شەرمۆکە و نەوێرەک بوویە، زار - زمانێ وێ تونە بوویە، کەسەکە گەلەک رەبەن بوویە. د داوییێ دە ژ حال دکەڤە، کەنا ژ بیر دکە. مێرێ وێ پاشێ ژێ دەردخە کو دییا وی ل ژنا وی هاتییە غەزەبێ، ژێ رە نەپاکە. مێرک برپارێ خوە دگرە وەکی جارەکە دن بزەوجە، دچە دگەرە، ڤێ جارێ ژ خوە رە کەچەکە ب ناڤێ گولسوون دبینە، تینە مالێ. گولسوون ئانگۆری ژنا بەرێ بووکەکە چاڤ ڤەکری، سەروەخت، شەرووت و ب زار - زمان بوویە. گەلەک جاران جەسارەت دکە ل دژی نەهەقییێن خاسییا خوە دەرد کەڤە، دلێ وێ چ بخوازە تینە جیه. د داوییا چیرۆکێ دە ژ بەر لێدانەکە گولسوونێ خاسی گەلەک بێحال دکەڤە، پاشێ ژی دمرە. ب ڤی تەحری هەردوو بووک ژ دەستێ ڤێ خاسییێ خەلاس دبن[24]. گەلەک چیرۆک هەنە کو د داوییێ دە بوونە بنگەهێ پەندێن پێشییا، مرۆڤ دکار بێژە هەر کۆکا پەندەکە پێشییا دچە دگهێژە چیرۆکەکێ و بوویەرەکێ، ژ بەر ڤێ یەکێ ژی د ناڤبەرا پەیدابوونا بەندێن پێشییا و چیرۆکان دە

پێوەندییێن خورت هەنە. هەر چیرۆکەک دەمەک هاتییە ئێدی کەتییە قالبێ هەڤۆکەکێ، کورت بوویە، وەک چەند پەیڤان کەتییە، تەحرەکی پەندێن پێشییان. مرۆڤ ڤان چیرۆکان «چیرۆکێن پەندێن پێشییا» ژی دکارە بناڤ بکە، وەک میسال «بووکێ تونە زار – زمان، خاسییێ تونە دین – ئیمان» د داوییا چیرۆکەکێ دە پەیدا بوویە، ئەڤ چیرۆکا وسانە : بووکەک تەزە ئانین پەیاکرن، خاسییا وێ رۆژا پێشین دو نان ئانین دانە بەر بووکێ و گۆتێ :«بووکێ جان، شەرم نەکە، لێ سەرێ نان کەرمەکە». بووکێ ژ شەرما وێ رۆژێ نان نەخوار، گۆت:«خاسییا من گۆتی یە سەرێ نان کەرمەکە». سێ رۆژ تەمام بوون ب ڤی تەحری، خاسییێ دگۆتە بووکێ، لێ بووکێ ژی نان نەدخوار. رۆژترا چارا دیسا خاسییێ نان دانی بەربووکێ و گۆتێ:«شەرمێ مەکە، لێ سەرێ نێن کەرمەکە». بووکێ دینا خوە دایێ ژ برچیا وێ قودوم کەڤە، ئەوێ ئانی ژ ئۆرتا نێن دەرخست خار، تەنێ قالکێ ل سەر نان ما. وسان سێ رۆژا بووکێ نان کەر نەدکر، تەنێ ئۆرتا نان دخوار، قالکێ نێن جی دە دهیشت. رۆژەکێ خاسییێ گۆتێ:«بووکێ، تو چرا ئۆرتا نێن دخوی قالکێ هشک ژی دهێلی؟». بووکێ گۆت:«تو خاسییا منی، چ تە دگۆت من ژی گورا تە دکر. وەختێ بووکێ تونە زار – زمان، خاسییێ تونە دین – ئیمان». هنگێ بووکێ خاسییێ رە خەبەردە، شەرم ژ ئورتێ رابوو[٢٥].

چاوا مە ل ژۆر ژی گۆت د داوییا چیرۆکا بووکا گولسوون دە، پشتی مرنا خاسییا وان، ئەڤ هەردوو هێوی دبن یەک، ب کێفا دلێ خوە شا دبن. ژ بەر کو چیرۆک خەلاس بوویە، مرۆڤ نکارە دەرحەقا پێوەندییێن ڤان هەردوو بووکان – هێوییان یێن پێشەرۆژێ دە تشتەکی بێژە. د چیرۆکێ دە، خاسیک و دو بووک هەنە، هەردو بووک ژی هێوییێ هەڤن. ژ



بەر کو د چیرۆکێ دە خاسیی هەیە، ڤێ جارێ شەرێ هێوییان دسەکنە، هێوی ل دژی خاسییێنە، دوبەندی، ناکۆکی و شەرێ ناڤ خوە بەر ددن، بخاسییا خوە ڤە مژوول دبن. ئەگەر چیرۆکێ دە مۆتیفا خاسییێ تونە بوویا، بێگومان شەرێ هێوییان دکاربوو مەزن ببوویا، د چیرۆکێ دە جیهەکی فرەهـ بگرتا. چاوا تێ زانین هاتنا ژنەکە نووهـ، دستاتوویا ژنا یەکەمین دە گوهاسنێن مەزن پێک تینە، جیهـ و روومەتا وێ نمز دبە، ژنا دووەمین تمێ دبە بەردلک و شرینا مێرێ خوە، چاوا پەندەکە پێشییان دبێژە: نووهـ هاتن، کەڤن هلاتن. د دەستپێکێ دە ئانینا ژنەکە نووهـ تمێ ژ مێران رە وەک بوویەرەکە خوەش تێ خویان، لێ بەلێ پشتێ دەمەکێ، شەرێ هێوییان دەست پێ دکە، هێوی دکەڤنە پێسیرا هەڤ، وێ چاخێ ئەو رۆژێن خوەشییێ ئێدی نامینن، وندا دبن، دەردێ پرژنییێ وێ دەمێ باش تێ فام کرن. د چیرۆکا (مێرێ دو ژنان)دە ئەڤ یەکا گەلەک ئەشکەرە تێ خویان (٢٦). د چیرۆکا (گولانچکزێرین)دە، دلێ پادیشاهەکی دکەڤە سێ کەچکێن مالەکێ، هەرسێیان ژی، ژ خوە رە تینە. پادیشاهـ ژ بەر بەرسیڤێن کەچا پچووک، زێتر ئەڤ کەچا حەزکرییە، لێ بەلێ هەردو کەچێن مەزن دەست پێ کرنە دەخەسییا کەچا پچووک کرنە. دەمەک دەرباس دبە، شەرەک دەردکەڤە پادیشاهـ دچە شەر، وێ دەمێ ژی ژنا پچووک دوجان بوویە، بەر حەملە بوونێ بوویە. پشتی چەند مەهان، دەما کەچا پچووک دوەلدە، هەردو خووشکێن مەزن گازی پیرکەکە بێ ئیمان دکن وەکی بێ ئالیکارییا کەچا پچووک بکە. دەما کەچک دوەلدە، ئەڤ پیرک ل شونا زارۆکان، دو جەورکێت «تولە، کودک» سا تینە نیشانی کەچکێ. ددە، زارۆکان ژی دکە ساندۆقەکێ دبن داڤێژنە ناڤ بەحرێ. دەما پادیشاهـ تێ، قالا ڤێ یەکێ دکن، پادیشاهـ دبێژە ل بەر مالێ سافیرەکێ

چێ بکن، ژنکێ و هەردو جەورکێن وێ ل ور گرێدن. سال دەرباس دبن، ئەو هەردو زارۆکێن پادیشاه یێن کو ئاڤێتبوونە بەحرێ «حوسەیین و گولیزار» ژ مرنێ خەلاس دبن، دەما ئەو زارۆک رۆژەکێ قالا سەرپێهاتییا خوە دکن، پاشێ پادیشاه فام دکە کو ئەڤ زارۆکێن وی یێن ژنا بچووکن، هەردو ژنێن وی یێن مەزن لیستکەکە ئانینە سەرێ ژنا پچووک. پاشا تینە ڤان هەردو ژنیێن مەزن جەزا دکە، ژنا پچووک ژی ئازاد دکە[٢٧]. چیرۆکا (میرزە مەحموود و خووشکا وی)، ژ گەلەک ئالییان دە دشبینە ڤێ چیرۆکێ. د چیرۆکا میرزە مەحموود و خووشکا وی دە ژی هێوییا مەزن حەسوودییا هێوییا پچووک دکە، د چیرۆکا رۆژین دە چ تێ سەرێ هێوییێ، تێ سەرێ ڤێ هێوییێ ژی، هەردو چیرۆک وەک شاخێن هەڤ دکارن بێن حەسبین، د داوییا ڤێ چیرۆکی دە، دەما پادیشاه فام دکە کو چ هاتییە سەرێ وی، تینە ژنا مەزن شەق – شەقی دکە دکوژە[٢٨] ناڤەرۆکا چیرۆکا بناڤێ (گولێ) ژی، وەک ڤان هەردو چیرۆکانە[٢٩]. د هەرسێ چیرۆکان دە ژی، دەردێ هێوییان وەک مۆتیفەکە هەڤبارە.

د ڤان چیرۆکێن کو ل سەر دەردێ هێوییان هاتنە گۆتن دە تشتەکی کو بالا مرۆڤان دکشینە ژی، رەوشا پیرانە، وەک کەسێن بێ ئیمان و سێرباز دناڤ کۆما «ژنێن خراب» دە جیه دگرن. د چیرۆکێن کوردی دە ئەم راستی چەند تیپێن پیران تێن. پیر، د زمانێ کوردی دە ب تایبەتی ژ بۆ ژنێن کو سالێن وان بهورینە تێ بکارئانین، جارجار ژ وان رە پیرەژن ژی تێ گۆتن. د چیرۆکێن کوردی دە ئەڤ پیر گەلەک جاران فامداری، زانە بوون و مێڤان حەزییا خوەڤە تێن ناسین. چاوا دچەند چیرۆکان دە ژی خویا دبە، ئەڤ پیران کەسە بەلەنگازن، تەنێ دمینن، چاڤێن وان ل دەستێ کەسێن مایینن رۆژێن خوە دپێن. ئەڤ تیپێن پیران گەلەک جاران ئالیکارن، قەنجی و



پاکییێ دخوازن، بەختان و مرازان دگهینن هەڤ، سوران رە ڤەکرینە، کەچ و خۆرت دکارن باوەرییا خوە ب وان بینن. ژ وان هنەک ژی دلرەشن، تمێ ل پەی خرابییێ نە، گلی – گۆتنا دگەرینن، گلی – گەرۆکن، غەیبێ مرۆڤان دکن. چاوا مە د چیرۆکا گولانچکزێرین دە قالا وێ کر، هن پیر ژی هەنە، ب تایبەتی دەما زارۆکانینێ دە ئالیکارییا ژنان دکن، ژ وان رە پیرک (ئەبە) دبێژن، د چیرۆکا گولانچکزێرین دە ئەو پیرکا وەک ژنەکە نەچێ تێ ناسین. تیپەکە مایین ژی پیرهەڤۆکن، ئەڤ کەسان وەک ژنێن چیرۆکی ژی دکارن بێن ناڤ کرن، تمێ خرابییێ دخوازن، خۆف و ترسا وان تمێ ل سەر مرۆڤانە، مەمکێن خوە داڤێژنە ل سەر ملێ خوە، پێشکاری مرۆڤان دبن، د ژیینا رۆژانە دە ئەڤ پەیڤا، ژ بۆ ژنێن بێتەر، بەد، نەبەدەو ژی تێ ب کارئانین.

د فۆلکلۆرا کوردی دە ژانا دامارییان، ژانا خاسییان، ژانا هێوییان و ژانا ژنتییان وەک چار مۆتیفێن بنگەهین جیه گرتنە. ڤان هەرچار مۆتیفان (داماری، خاسی، هێوی، ژنتی) د ناڤ فۆلکلۆرا کوردی دە سوورەتەکی «ژنا خراب» پەیدا کرنە.

د چەند چیرۆکێن کوردی دە بێبەختی و نەحەلالییا ژنان، بوویە سەدەمێ مالوێرانی، مالکامباخییان. ب تایبەتی ژنێن کو مێرکرینە، لێ بەلێ ب مێرەکی مایین رە سەرێ خوە دکنە یەک، د ڤان چیرۆکان دە وەک ژنێن روو ب تەنی حەسبین، گەلەک جاران ژی، د داوییا چیرۆکان دە تێن کوشتن. ئەڤ ژنێن کو ب یارن، ژنێن کو نابن خوەدییێ نەفسا خوە، ب دزیکاڤە مێرێن دن رە رادزێن، ب وان رە شا دبن، د ڤان چیرۆکان دە گەلەک ب فەسال گاڤێن خوە داڤێژن، دەک – دۆلاب، فەند – فێلێن مەزن تینن سەرێ مێرێن خوە، جارجار ب زانەتی وەک میسال خوە نەخواش داتینن، ژ

بۆ کو ئیمکانا هەڤدیتنا دلکەتییێ خوە پەیدا بکە، مێرێ خوە بۆنا «دەرمانەکی» دشینە «وەلاتێ هات – نەهاتێ». لێ بەلێ د داوییا چیرۆکان دە هەر تشت ئێدی ئەشکەرە دبە. چیرۆکا (ئاڤا حەیاتێ – سێڤا خەلاتێ) د ڤی واری دە گەلەک بالکێشە. ژنک خوە نەخواش داتینە، دبێژە مێرێ خوە، تێ هەری ژ من رە ئاڤا حەیاتێ و سێڤا خەلاتێ بینی. مێرک تڤدارەکێ خوە دکە، تەرکەسەری دنێ دبە. دچە گوندێ مالا خووشکا خوە ، خووشکا وی زانە نە ئاڤ، نە ژی سێڤەکە وسان هەیە، دبێژە برایێ خوە، ژنا تە ب یارە، ڤەگەرە هەرە مالا خوە! ئەو تە دخاپینە. پاشێ برا و خووشک دکەڤنە دلقێ دو گەرۆکان، دچن دبینن کو گۆتنێن خووشکا وی راستن، ژنا وی ب یارە، هەردوویان ژی دکوژن[٣٠]. د چیرۆکا (بەنگلیبۆز)دە، ژنەکە پادیشاهەکی هەبوویە، ناڤێ وێ سولتان بوویە، دەما مێرێ وێ دچە شەڕ، ئەو نێتا خوە خراب دکە، ب وەزیرێ پادیشاه رە رادبە – روودنێ. هەسپەکی پادیشاه ژی هەبوویە، هەسپەکی سێرباز بوویە، دکاربوویە دەنگ ژی بکە. هەسپ، رۆژەکێ کورێ پادیشاه رە، قالا دییا وی و وەزیر دکە، ئێدی پێوەندییێن دییا وی و وەزیر ئەشکەرە دبن. د داوییا چیرۆکێ دە، ئەڤ ژنک تێ کوشتن[٣١]. د چیرۆکا (سلۆ و رەهمۆ) دە هەژمارا ژنێن ب یارک هەر دچن زێدە دبن. سلۆ دگۆمەکێ دە خوە ڤەدشێرە، مێزە دکە دۆر ب دۆر سێ مێرێن چێپتازی هاتن گۆمێ تەڤی پێز بوونە. ئەڤ کەسان، یارکێن وێ ژنا کو سلۆ د گۆما وێ دە خوە ڤەشارتییە، بوونە. دەما مێرێ ژنکێ تێ، دچە گۆمێ راستی چەند کەسان تێ، سلۆ مێرک رە دبێژە، ئەڤ یارێ ژنا تەنە. سلۆ ژی رادبە دچە مالا خوە، دێری دخە ژنا وی دێری ڤەناکە، ژنا وی ژی ب یارە. ژنک یارێ خوە دکە کووپەکی، ڤەدشێرە. پشتی دەمەکێ مێر ڤی کووپی دبە دفرۆشە، ددە جهووکی. جهوو دبێژە سلۆ، ڤی کووپی ببە مالا من، دەما سلۆ کووپ دبە مالا جهوو، مێزەدکە هەفت بووکێن جهوو هەریەک ژ وان ب یارێ خوەڤە کەتنە ناڤ کێف و حەنەکان. دەما بووک چاڤ ل سلۆ دکەڤن، بەمبوو داڤێژن ل سەر یارێن خوە، وان ڤەدشێرن، پاشێ جهوو تێ مالێ، هەر تشت ئەشکەرە دبە[٣٢]. د داوییا چیرۆکێ دە، یارێ ژنا سلۆ و یارێن هەفت بووکێن جهوو ژی تێن کوشتن. چاوا د چیرۆکێ دە ژی تێ خویان، هەم ژنێن ب یار، هەم ژی مێرێن ب یار رە ئیمکانا ژیینێ زێدە نامیینە. د چیرۆکا (سلقۆ) دە، ڤێ جارێ هەر چڤاس سلقۆ ژێ دەردخە ژنا وی ب یارە، دنێرە خۆرتەک دناڤ جیهێ ژنا وی دە یە، ژنکێ ناکوژە، تەنێ بەر ددە، پاشێ ژنەکە دن ژخوە رە تینە[٣٣]. چیرۆکا (بلا ئەو نان و ماستێ خوە بخوە) وەک پێکەنییان هاتییە گۆتن، رۆژەکێ مێرەک دچە لەشکەرییێ، هەفت سال لەشکەرییێ دکە. دەما ڤەدگەرە تێ مالا خوە، مێزە دکە کو سێ زارۆکێن وی هەنە، ئەو شاش – مەتەل دمینە، دەما ژنا خوە دپرسە وەکی ئەڤ زارۆک یێ کێ نە، بەرسیڤا ژنکێ مێرک تێر ناکە، ئێدی هەر تشت دەردکەڤە هۆلێ، مێرک فام دکە کو ئەو زارۆک نە ژ وی نە [٣٤].

## ژنێن دەستگران

چاوا ئەم ل ژۆر ژی ل سەر سەکنیبوون، د چیرۆکبێژییا کوردی دە مێرێن ترال شل – شەلا، تمێ ل مالێ نە، کێری، تشتەکی نائێن، بوونە بابەتێن گەلەک چیرۆکان، جڤاتێ ئەو کەسان د ناڤ کۆما «مێرێن خراب» دە ب جیە کرنە. وەک مێران ڤێ جارێ ئەم راستی ژنێن وسان ژی تێن. ئەڤ ژنان ژی ترالن، خەباتەکێ ناکن، هەر تشتی ژ خوەدێ، ژ دۆربەرێ خوە هێڤی دکن، د داوییێ دە پەریشان دبن، دکەڤن ل سەر زار – زمانان و دبن بابەتێن چەند چیرۆکان ژی. د چیرۆکا (مەنا کۆمەکێ) ژی گۆتی هەبە دە دایک و کەچەک هەنە[٣٥]، د چیرۆکا (ئاردو) دە باڤ، کەچەک[٣٦] و د چیرۆکا (ریبا شخرێ) دە ژی پیرەژنەک، دۆتەک و پشیکەک هەیە[٣٧]. هەموو مێرخاسێن ڤان هەرسێ چیرۆکان ژی، بەری کو زڤستان بێ قەت تڤدارەکێ زڤستانێ ناکن. د ڤان هەرسێ چیرۆکان دە دایک، پیرەژن و باڤ دبێژن چاوا هەبە ئەمێ بمرن، نە هەوجەیە ئەم کار بکن، هەرسێ کەچێن ڤان چیرۆکان ژی دفکرن، دبێژن ئەمێ هەتا وێ چاخێ ژ خوە رە مێرەکی ببینن، ئەمێ بزەوجن، د چیرۆکا داوین دە پشیک ژی دبێژە، دەما ئەو مرن و زەوجین ئەزێ ژی هەرم مالا جیرانان، ببم پشیکا وان. لێ بەلێ زڤستان تێ، نە ئەڤ دایک، پیرەژن و باڤ دمرن، نە ژی کەچ مێر دکن. دەما زڤستان تێ ئەڤ کەسێن ترال، جانگران گەلەک پەریشان دبن، دەستێ کەسێن مایین دنێرن، ژ بۆ کو ژ خوە رە ئاردو و خوارنێ بەرەڤ بکن، دکەڤنە چۆلان. د داوییێ دە مێزە دکن کو ژیین چاوا ئەو دفکرن ئەوقاس هێسا نینە. ژ ئالییێ دن چاوا ئەم دبینن بابەتا ڤان هەرسێ چیرۆکان ژی گەلەک نێزیکی هەڤە، وەک شاخ و گوهارتنۆکێن هەڤن. ئەڤ یەکا ژی نیشان ددە کو، تەما ڤان چیرۆکان ژ ئالییێ جڤاتێ دە گرنگی هاتییە دیتن کو ئەڤ چیرۆک ئەوقاس بەلاڤ بوونە، ناڤ دانە.



## چەند چیرۆکێن ژییانا رەئال

گەلەک چیرۆک ل سەر ژییانا کوردان هاتنە گۆتن، ئەڤ چیرۆکان، چیرۆکێن راستی (رەئال) تێن ب ناڤکرن. د ژییانا رۆژانە دە، ئەڤ بوویەر ل سەر مرۆڤان و ل سەر جڤاتێ رە دەرباس بوونە، وەک نەینکا جڤاتێ نە. ژ ئالییێ دیرۆکی، دەرهەقا سال و دەمێن بهوری دە، ئەڤ چیرۆک مە گەلەکی رۆنی دکن، قەوماندنێن کو ئەم د ڤان چیرۆکان دە راستی وان تێن، وەک قەوماندنێن بوویی دکارن بێن حەسبین. چاوا تێ زانێن جڤاتا کوردی وەک جڤاتەکە فەئودال ژ گەلەک ئێل – عەشیران پێک هاتییە. ژ ئالییێ دن باندوورا سەرۆک عەشیر، ئاغا، شێخ و مەزنان ل سەر جڤاتێ تمێ مەزن بوویە. دوبەندی، ناکۆکی، شەر – دەوێن ناڤبەرا ڤان هێزان تمێ بالا جڤاتێ کشاندییە، د هش و مێژوویێ جڤاتێ دە جیهەک گرتییە، کەتییە ل سەر زار – زمانێ جڤاتێ، بوونە چیرۆک. هەڤکوشتن، خوون رژاندن، دژمناهی و شەر وەک مۆتیف بوونە بابەتێ گەلەک چیرۆکان. دڤی واری دە چیرۆکا هەرە بالکێش، چیرۆکا سوتۆ و تاتۆیە. بوویەرێن چیرۆکێ ل دەڤەرێن بادینان دەرباس دبە. سوتۆ سەرۆکێ ئێلا دوسکانی تاتۆ ژی سەرۆکی ئێلا رێکانی یە. شەرەکی بێهەمپا دناڤبەرا ڤان هەردو ئێلان دە دەست پێ دکە، ب هەڤرا دژمناتیکە مەزن داژۆن. هێزێن دەولەتێ، ئاغا و شێخێن مایین ژی تەڤی ڤی شەری دبن، سوتۆ و مەرڤێن خوە گەلەک بێبەختی، تەعدا زۆردەستییێ ل مەرڤێ ئێلا تاتۆ دکن د داوییێ دە گەلەک مرۆڤان ژ هەڤ دکوژن. ژ بۆ تۆلا هەڤ بستینن هەردو ئێل پێسیرا هەڤ بەر نادن. پاشێ گەلەک هێزێن مایین دکەڤنە ناڤ، دخوازن وان ب هەڤ بینن، د داوییێ دە هەردو ئالی ژی ب هەڤ تێن. سوتۆ کەچا خوە ددە

تاتۆ. دەما خوون هات رژاندن، ژ بۆ هەڤهاتنێ، ل پێشی خوونێ دایینا
کەچەکێ دناڤ کوردان دە عەدەتەکێ کەڤنە، وەک نیشانا ئاشیتییێ دکارە
بێ حەسبێن. لێ بەلێ سوتۆ، رۆژەکێ خوە ب زانەتی نەخواش داڤێژە، تاتۆ
مرۆڤێن خوەڤە تێن سەریکی بدنی وی. دەما ئەو دچن رازێن، مرۆڤێن
سوتۆ لێ دخن تاتۆ و مرۆڤێن وی دکوژن. ب ڤی تەحری سوتۆ تۆلا خوە ژ
دژمنێ خوە دستینە و پاشێ رادبە سەرخوە سوپاسی خوەدێ دکە[٣٨]. د
چیرۆکا (رەڤاندنا قەرەچییەکێ) دە دیسا گەلەک مرۆڤ، قاسی چل کەس
ژ عەشیرا مال مەزنان تێ کوشتن. رۆژەکێ خۆرتەکی عەشیرا مال مەزنان
کەچەکە قەرەچییان درەڤینە. دەما قەرەچی پێ دحەسن، داڤێژنە سەر
عەشیرا مالمەزنان، چل مرۆڤێن وان دکوژن، پاشێ ڤەدگەرن مالێن خوە. د
چیرۆکێ دە دەما سەرۆکێ عەشیرا مالمەزنان ژێ دەردخە کو ئەو قاس کەس
ژ بۆ کەچەکێ مرنە، گازی خۆرت و کەچکێ دکە، دخوازە ڤان هەردویان ژی
بکوژە. لێ بەلێ دەما مێزە دکە دلێ لاوک گەلەک د کەچکێ دە هەیە،
دەست ژ کوشتنا وان بەردە، سەرۆکێ عەشیرا مالمەزنان، چاوا تێ خویان
زەواجەکە ب کەچا قەرەچییان د جیە دە نابینە[٣٩]. د ڤی واری دە چەند
چیرۆکێن کو ئالەکساندەر ژابا بەرەڤ کرنە و وەک پرتووک وەشاندییە زێتر
بالا مرۆڤان دکشینن، مۆتیفێن دەرهەقا رەوشا ژنێن کورد، د ڤان چیرۆکان
دە گەلەک خورت و بالکێشن. د چیرۆکا (هەیشتان) دە دلێ دوخۆرتان
دکەڤە کەچەکە ب ناڤێ بارنیک. ناڤێ ڤان خۆرتان یەک شماسی، ناڤێ
یێ ماییێ ژی چۆلۆ یە. جارا پێشین بارنیک ددەنە شماسی شماسی یەکی
دەولەمەند، چۆلۆ یەکی بەلەنگاز بوویە. لێ بەلێ دلێ کەچکێ دکەڤە
چۆلۆ. پاشی ئەڤ هەردو خۆرت دکەڤنە قرکا هەڤ، هەردو ژی تێن کوشتن.
د داوییێ دە کەچک ژی ب خەنجەرێ خوە دکوژە، کەچکێ دبن ل بال



مەزەرێ چۆلۆ گۆر دکن. د چیرۆکا دۆنزدەهان دە سەرپێهاتییا دو برایێن
بێکار جیە گرتییە. دلێ برایێ مەزن حەسەن ئاغا دکەڤە ڤێ کەچا ب ناڤێ
لالی خانم. پاشێ دەما برایێ وی یێ پچووک چەلەنگ ئاغا ڤێ کەچکێ
دبینە، دلێ وی ژی دکەڤە کەچکێ، ئەڤ برایێ بچووک لیستکەکێ تینە
سەرێ برایێ خوە یێ مەزن، برا دەڤ ژ کەچکێ بەردە، برایێ بچووک ب
وێ رە دزەوجە، لێ بەلێ دلێ کەچکێ برایێ مەزن - حەسەن ئاغا دە
هەبوویە. د داوییێ دە کەچک ژەهرێ دخوە، دمرە. چیرۆکا نۆزدەهان دە
پاقژی، حەلالی ، دلۆڤانی و جەسارەتێ ژنان تێ زمێن. ئانگۆری چیرۆکێ
مرۆڤەک هەبوویە، ل باژارێ بتلیسێ دما. ناڤێ وی جەرگۆ، ناڤێ ژنا وی
ژی گوزەل خاتوون بوویە، رۆژەکێ ژنا وی ب مێڤانی دچە گوندێ مالا
باڤێ خوە. دەمەک دەرباس دبە، جەرگۆ خولامێ خوە دشینە پەی ژنا خوە
وەکی هلدە بینە مالێ. ناڤێ خولێم کرێت بوویە. خولام د رێ دە نێتا خوە
خراب دکە، دلێ وی دکەڤە ژنا ئاغا، پێشکاری ژنکێ دبە. ژنک دەما
فرسەندەکێ دبینە، تینە کرێت دکوژە، هەردو ملێن وی ژی ژێ دکە، دبە
نیشانی مێرێ خوە و خەلقێ ددە، پاشی هەرکەس پەسنێ گوزەل خاتوونێ
ددە[٤٠].

## ژنێن راورین

دەما مرۆڤ چیرۆکێن کوردی بەش - بەش ئانالیز بکە، ژ هەڤ دەرینە، مرۆڤ دبینە کو گەلەک چیرۆک ژی، ل سەر راور (تابە، تەرەول، لاور، حەیوان) هاتنە گۆتن. ژ بەر کو پڕانییا کوردان د زکێ تەبیعەتێ دە دژین، د ژییانا وان یا رۆژانە دە ئەو و راور دناڤ هەڤ دە نە، گەلەک راوران دپارێزن. شڤان، گاڤان، بەرخڤان، گۆلکڤان و گەلەک کەسێن مایین هەر یەک ژ ئالییێ خوە دە پسپۆرەکی راورانە. هەم راورێن هۆڤ، هەم ژی راورێن کەدیکری د چیرۆکان دە وەک مرۆڤان گاڤێن خوە داڤێژن، جلێن مرۆڤان خوە دکن، دبن پارچەکی ژییانا مرۆڤان. مرۆڤ و راور ژ گەلەک ئالییان دە دشبینن هەڤ. د داوییا چەند چیرۆکان دە، ژ بەر خرابی و نەپاکییا خوە، چاوا ئەم دبینین ئەو دبن راور، وەک پەپووک، هرچ، ژووژی، مەیموون تەرکەسەری دنێ دبن. دەما ئەم ناڤەرۆکا ڤان چیرۆکان مێزە دکن، یەک ژ مێرخاسێن چیرۆکێ ژ خوەدێ رە دوعایان دکە، لاوا دکە، وەکی ئەو کەسێ خراب و نەپاک ببە راورەکی، داخوازیێن ڤان کەسان دەرحال تێن جیه. ئەو کەس دبە چ لاوری؟ ئەڤ یەکا ئانگۆری ناڤەرۆکا چیرۆکێ، رەوش و کرنێن ڤان کەسان رەگرێدایی یە. ب سایا ڤان چیرۆکان ئەم سەدەمێن پەیدابوونا هەر راورەکی ژی فێر دبن(٤١).

ناڤەرۆکا هنەک چیرۆکێن کوردی ب تەمامی ل سەر راورانە، بەشەکە وان ژی نیڤی راورن، نیڤی مرۆڤن، د چەند چیرۆکان دە ژی، هەرچقاس تەمام راور بن ژی، فۆرمەکی هونەری د ڤان چیرۆکان دە پەیدا بوویە، چاوا ئەم دبینن ڤێ جارێ وەک میسال ب دەڤێ راورەکی ئان ژی راورەکێ چیرۆکەکە ل سەر مرۆڤان تێن گۆتن، د ناڤ هەڤسازییا چیرۆکەکە درێژ دە



ب سەرێ خوە جیه گرتییە. دەما ئەم ڤان چیرۆکێن د ناڤ چیرۆکان دە مێزە دکن، ب ئالیکارییا ڤان «چیرۆکێن پچووک» راور دخوازن نیێت، مەرەم و مەساژا چیرۆکی خورت بکن. ئانگۆری ڤی رووچکی هونەرا چیرۆکبێژییێ، ب دەڤێ راوران شیرەت ل مە تێن کرن، راور رەوشا خوە و بوویەرێن ڤان چیرۆکێن کو دبێژن، هەمبەری هەڤ دکن، ژ خوە رە دکن پێلەکان، ماتەریال و داخوازا خوە یا داوین پێشکێشی مە دکن. چاوا تێ زانین وەک هەبوونێن ژیندار (زێندی، جاندار، رووحبەر) د ناڤبەرا مرۆڤان و هێزێن نە - مرۆڤی دە، وەک میسال راوران دە گەلەک نێزیکاهی و درووڤلێکەتنێن بالکێش هەنە. گەلەک بابەتێن چیرۆکێن راوران هەنە، ناڤەرۆکێن وان ژ مۆتیفێن گەلەک جودا - جودا پێک تێن. د ناڤ ڤان مۆتیفان دە مۆتیفەکە بنگەهین ژی، مۆتیفا ژنان و زەواجێ یە. دڤی وارێ دە چیرۆکەکە هەواسکار، شیرەتکار، چیرۆکا ب ناڤێ زەواجا (قژک و کەڤۆکێ) یە. ئانگۆری چیرۆکێ، قژک مێرە، کەڤۆک ژی ژنە، ب هەڤرا دزەوجن، لێ بەلێ پشتی دەمەکێ بە هەڤ ناکن، د خوازن هەڤ بەردن. ئەو دچن ل بال قازییەکی، هەر یەک قالا رەوشا خوە دکە و چیرۆکەکێ قازی رە دبێژن. سەدەمێ گۆتنا ڤان چیرۆکان ژی، هەر یەک ژ ئالییێ خوە دە ب میسالێن خوەشک ڤە دخوازە قازی بدن باوەر کرن، وەکی کی هەقە، کی نە هەقە، دخوازن ل پێشبەری قازی وەک دادگەهەکێ خوە بپارێزن. ئەم ژ ناڤەرۆکا چیرۆکێ دەردخن کو، کەڤۆک دۆزا هەڤبەردانێ دکە، دخوازە ژ مێرێ خوە قژکێ ڤەقەتە، وی بەردە. ئانگۆری ئیفادە و گۆتنێن کەڤۆکێ، مێرێ وێ کەسەکی پیسە، تمێ قلێر و قرێژە، دچە سەر جەندەک، کەلا خان، تمێ تشتێن پیس دخوە، بینا گەنی ژ دەڤێ وی تێ. ژ بەر ڤان سەدەمان کەڤۆک دخازە ژ قژکێ ڤەقەتە. چاوا مە زۆر ژی گۆت، هەردو دچن ل بال قازیکی

باوەری و نێرنێن خوە ل سەر ڤێ هەڤ بەردانێ پێشکێش دکن. پێشییێ کەڤۆک، قالا زۆردەستییا کو ل سەر ژنان هەیە دکە، ڤێ یەکێ وەک نەهەقیکێ د جی دە نابینە. پاشێ قڕک ژی، بێبەختییا ژنان شرۆڤە دکە ل سەر نەهەقییا ژنان دسەکنە. پشتی کو هەر یەک خوە دپارێزە، ڤێ جارێ هەریەک چیرۆکەکێ ژی دبێژە وەکی باوەری و دیتنێن خوە خورت بکن. پێشییێ قڕک چیرۆکەکێ دبێژە. ئەڤ چیرۆکا کو قڕک دبێژە، بێبەختییا ژنان ئەشکەرە دکە، وەک میسال میرزە محەمەد رۆژەکێ ب چاڤێ خوە دبینە کو ژنا وی و هەردو ژنێن برایێن وی ب کەسێن خەریب رە نە، خوە تازی دکن، ب ڤان مێران رە دکەڤنە ئاڤێ، هەڤ شا دبن، کێفا خوە دنێرن. پشتی ڤان گۆتنێن قڕکێ دۆر تێ کەڤۆکێ وەکی باوەری و نێرینێن خوە ژ قازی رە پێشکێش بکە. پشتی چەند گۆتنان، ئەو ژی چیرۆکەکێ دبێژە. ئانگۆری چیرۆکا قڕکێ مرۆڤەک هەبوویە، ناڤێ وی مەمۆ بوویە، مەمۆ دەما زەواجا وی تێ، ب دۆتماما خوە رەوشێ رە دزەوجە. دەمەک دەرباس دبە، ڤێ جارێ مەمۆ دچە هەڤالا ژنا خوە یا دبستانێ ژی وەک هێوی بینە. ژنا وی، ژ بۆ کو بەلاک نەیێ سەرێ مێر، دکەڤە دلقێ مێرەکی، ناڤێ خوە داتینە ئەحمەدێ کال. دچە دگهێژە مێرێ خوە، لێ بەلێ مێر نزانە ئەو ژنا وی یە. ئەو تمێ ئالیکارییا مێرێ خوە دکە کو قەزا - بەلاک نایێ سەرێ وی. پاشێ دەما ئەو هێوییێ تینە سەر رەوشێ، ڤێ جارێ دەست پێ دکە رەوشێ دخە، وێ دکوتە. فەداکارییا کو رەوشێ ژێ رە کرییە نزانە ... کەڤۆک چیرۆکا خوە درێژ دکە، هەتا کو قازی ددە باوەرکرن کو مێر تمێ نەهەقییا ژنان دکن و مێرێ وێ قڕک ژی مێرەکێ نەپاکە. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی دخوازە مێرێ خوە بەردە چیرۆک ب ڤێ تەحری خەلاس دبە(٤٢). مرۆڤ ئێدی نزانە کو قازی هەق دایە کیژان ئالیی. چیرۆکبێژ مڪونە وەک



فۆرمەکی مافێ بڕیار داییناێ ژ خوەندەڤان و ژ گوهداران رە دهێلە. چیرۆکا زەواجا قڕک و کەڤۆکێ د بابەتا پرۆبلەماتیکا ژنان دە چیرۆکەکە گەلەک هینکار (دیداکتیک)ـە. ژ بەر کو هەردو ئالی چ ژن، چ مێر دڤێ چیرۆکێ دە سەدەمێن هەڤبەردانێ ب ڤەکری، ب میسال و ب ئالیکارییا چیرۆکێن ماییێن رابەری خوەندەڤانان و گوهداران دکن.

چیرۆکا کوند و بلبل ژ ئالییێ دلۆڤانی، پاقژی، حەلالی، نەفس و قووەتا دانباوەرکرنا ژنان دە مە زێتر رۆنی دکە، چیرۆکەکە باندوورهیشتە. رۆژەکێ چاوا دبە کوند رییا خوە شاش دکە، دچە بەر قولا بلبلی. دخوازە هەرە بال بلبلێ. بلبل ژنەبیکە خوەیێ چەند زارۆکان بوویە. کوند چڨاس لاوا دکە، بلبل دیسا دێری لێ ڤەناکە، دەما دنێرە نکارە کوند بدە باوەرکرن، ڤێ جارێ ژێ رە قالا چیرۆکەکێ دکە. ئانگۆری چیرۆکێ ل باژارێ حەلەبێ پاشاک دما، سەرکارەکی خولامێن پاشێ هەبوویە، ناڤێ وی عەلۆ بوویە. رۆژەکێ دەما پاشا دچە حەج، کارێن مالا خوە دسپێرە عەلۆ. سێ کەچێن پاشێ هەبوونە. عەلۆ دۆر ب دۆر چاڤ بەردده کەچێن پاشێ. لێ بەلێ کەچا پچووک، کەچەکە بێتەر بوویە، عەلۆ ئەو نکار بوویە بینە رێ، د داوییێ دە وێ داڤێژە چەلەکێ، هەتا باڤێ وێ تێ. پاشێ ژی ئێفترا داڤێژە کەچکێ، ژ باڤێ رە دبێژە، دبێ کەچا تە، دەما تو نە ل ڤرا بوویی کەرخانە ڤەکربوو، تمێ ل سەر رییان دەرپییێ خوە دەردخست ... پشتی ڤان گۆتنان گەلەک بەلا تێنە سەرێ کەچکێ، باڤ دخوازە وێ بکوژە، پاشێ ئەو رێکێ دبینە خەلاس دبە. دەما بلبل ڤێ چیرۆکێ درێژدکە، کوند گەلەک عاجز دبە، دبێ ئەڤ چیرۆکا گەلەک درێژە، تونکاری قوت بکی. لێ بەلێ بلبل، هەتا کو کوند بکەڤە بمرە، چیرۆکا خوە ددۆمینە. ب مرنا کوند ڤە ئێدی چیرۆکا بنگەهێن دقەدە، خەلاس دبە(٤٣).

هەم چیرۆکا زەواجا قژک و کەڤۆک، هەم ژی چیرۆکا کوند و بلبل ب تەحرەکی ئالەگۆریک رەوشا ژنان، پرۆبلەم و ئێشێن وان، زۆردەستییێن ل وان تێن کرن، ب ستیلەکە هونەری رادخن ل بەر چاڤان. چاوا تێ خویان ئەو «چیرۆکێن ناڤ چیرۆکان» بەدەویکە مەزن ددن ڤان هەردو چیرۆکان. د ڤان چیرۆکێن راوران دە، چاوا ئەم دبینن ژنێ کو کنجێن راوران ئان ژی راورێن کو کنجێن ژنان خوە کرنە، ژ وان هەر یەک پرۆبلەمەکە ژنان پێشکێش دکە. د چیرۆکا (کێز خاتوون) دە، کێز خاتوون پشتی گەرەکە درێژ ژ خوە رە مێرەکی دبینە، پێ رە دزەوجە، ناڤێ مێر مشکۆ ئاغا بوویە. کێز خاتوون هەرچقاس بەدەو بوویە، هەر ئەو قاس ژی قورە و پۆزبلند بوویە. د داوییێ دە کێز خاتوون دبە گۆرییێ ڤێ قورەتی و پۆزبلندییا خوە، ژ ئالییێ مشکۆ ئاغا دە تێ کوشتن[٤٤].

چاوا مە ل ژۆرێ ژی پێشکێش کر دڤان هەرسێ چیرۆکێن کوردی جۆتەک راور کنجێ ژن – مێران خوە دکن، دکەڤن دلقێ مرۆڤان، ب هەڤرا دزەوجن (قژک – کەڤۆک، کوند – بلبل، کێز – مشک). دڤێ ڤان هەرسێ چیرۆکان دە ژی، ئەم راستی تو زەواجەکە، دلشا نایێن، یا هەڤ بەردن یان ژی دبن باعیسێ مرنا هەڤ. ژ ئالییێ دن چیرۆک هەنە، ژ ڤان جۆتان یەک مرۆڤە، یەک ژی راورە، ب هەڤرا دزەوجن، دبن ژن– مێرێن هەڤ. د چیرۆکێن مار[٤٥]. و هەمەند

دە، ڤێ جارێ مارەک وەک خۆرتەکی دخوازە ب کەچا پادیشاه رە بزەوجە. پشتی چەند تەقەرەڤان ئەو دچن، دگهێژن مرازێ خوە. ئەڤ هەردو چیرۆک ژی، ژ گەلەک ئالییان دە وەک هەڤن، مرۆڤ دکارە بێژە، شاخێن هەڤن ژی. مار هەول ددە کو مارتییا خوە زێدە نیشان نەدە، بالا مرۆڤان زێدە نەکشینە سەرخوە، لێ بەلێ دیسا ژی ژ دەستێ وان نافلتە، داوییێ



دە دیسا یا خوە دکە، ب کەچا پادیشاه رە دزەوجە. ئەگەر ئەم ژ دنیا چیرۆکان پچەکی دوور بکەڤن د ژییانا رۆژانە دە مار چاوا ئەم زانن وەک راورەکی زێتر ب کوڤیتییا خوە، زۆردەستی و ئیریشکارییا خوە ڤە تێ ناسین[٤٧] . د ناڤ کوردان دە مار، راورەکی زێدە حەزکری نایێ حەسبین، ئانگۆری لێکولێنڤانەکە ترک یا کو گەلەک چیرۆکێن کوردی وەرگەراندنە ترکی، پێوەندییێن نەخوەشییا مار و تونەبوونا ئاڤا پاقژ گەلەک خورتن. ئانگۆری وێ، ئەو کەسێن کو ئاڤا نەپاقژ ڤەدخون، ل گۆر باوەرییا وان، د زکێ وان دە ئیمکانا پەیدابوونا مەران زێترە، ئەڤ یەکا ژی دبە باعیسێ ترسا ماران[٤٨]. لێ بەلێ د فۆلکلۆر و میتۆلۆژییا کوردی دە، ئەڤ سوورەتێ ماران یێ ئێریشکار وسان ب هێز و خورت نینە. چیرۆکا شاهماران «شاهێ ماران» دە مار ب سوورەتەکی گەلەک مرۆڤی هاتییە خەملین. ئانگۆری ڤان میتۆلۆژییان مار وەک فیگورەکی میتۆلۆژیک ژ ناڤێ بەرژێر وەک مار، ژ ناڤێ بەرژۆر وەک کەچەک بەدەوە. مار ئانگۆری ڤێ میتۆلۆژییێ بوویە نیشانا بەدەوی و خوەشییێ، ناڤێ شاها ڤان مارێن نیڤ – مرۆڤ و نیڤ – مار، ئانگۆری میتۆلۆژییێ شاهماران بوویە[٤٩]. دەما مرۆڤ ڤان هەردو چیرۆکێن کو مە ناڤێ ڤان ل ژۆر دایە و میتۆلۆژییا شاهمەردانێ ددە بەر هەڤ، مرۆڤ ڤان هەردو چیرۆکان دە ستوورەتەکی ماران یێ نێزیکی مرۆڤان دبینە.

## ژنێن چیرۆکی

ژ ئالییێ دن ژن هەنە تەنێ ژنێن چیرۆکی و میتۆلۆژیکن، نە مرۆڤ، نە ژی راورن. ئەو گەلەک جاران وەک کەچێن دێوان، حووت، جنان و وەک پیرهەڤۆکان تێن ناسین، حۆری، پەرینە، چاوا، مە د دەستپێکی دە ژی گۆتبوو، دەما ئەو مێرخاسێن بەرێ خوە ددنە «وەلاتێ هات – نەهاتێ»، ئەو دچن راستی ڤان دێو، حووت و جنان تێن، ئەڤ عەرد وەلاتێ وانە، گەلەک مێرخاس ل ڤی وەلاتی ناسییا خوە ددن کەچێن وان، دبن هەڤال، پاشێ ڤەدگەرن تێن جی – مەسکەنێ خوە. دەما ئەو دچن لنگێ خوە داڤێژنە وەلاتێ هات – نەهاتێ، ئەڤ دێو، حووت و جن فام دکن کو بینا «بەنی» یان، «بەنی ئادەمان» تێ، «عەڤدێ سەررەش» هاتنە وەلاتێ وان، مرۆڤان زوو ناس دکن، دەست پێ دکن ئیفادەیێن وان دگرن، جارجار ژی گەلەک شەڕ – دەو، مرن – کوشتن پێشتا تێن. دیسا مە د دەستپێکی دە گۆتبوو، دەما کەسەک دچە خوازگینییێ کەچەکێ، باڤێ وێ چەند مەرجێن گران و دژوار پێشدا داڤێژە، عەردێ پێک ئانین و جیهئانینا ڤان مەرجان ژی ب تایبەتی ئەڤ وەلاتێ هات – نەهاتێ یە، ئەڤ کەسان مەجبوور دبن بەرێ خوە ددن ڤی وەلاتی. مۆتیڤەکە دن ژی، دەما کەسەک بەد حال دکەڤە، نەخوەش دبە، ژ بۆ دیتن و پەیدا کرنا دەرمانەکی ئەو دچن ڤی وەلاتی، ئەو وەک میسال پەی سێڤا خوەشییێ و ئاڤا حەیاتێ دکەڤن ... جارجار ژی ژنێن کو دخوازن دەمەکێ ژ مێرێن خوە دوور بکەڤن، سەدەم و باهانەیێن جودا دبینن و مێرێن خوە دشینن ڤان وەلاتێن دوور. چیرۆکا (سلێمانێ زندی) دڤێ بابەتێ دە چیرۆکەکە پڕ گرنگە. باڤێ سلێمانێ زندی ژ ئالییێ هووتەکی دە تێ کوشتن. ئەو ژی هەفت کورێ هووت دکوژە،



باڤێ وان ژی دیل دگرە، تینە دەست – پییێ وی گرێددە، داڤێژە چەلەکێ، سەلەکی داتینە سەر چەلێ. ڤێ جارێ دیبیا سلێمانێ زندی دبە ئەڤینداریێ حووت. ژ بۆ کو ئەو و هووت ب رەحەتی هەڤ ببینن، ب هەڤرا شابن، ئەو خوە ناخواش داتینە، کورێ خوە سلێمانێ زندی دشینە دیتنا دەرمانان (زەبەشێ هووتان و شیرێ شێران). دیبیا وی د وێ باوەرییێ دەیە کو، دەما سلێمانێ زندی چوو ڤان دەڤەران، دێوێ وی بکوژن، ئێدی ڤەگەرا وی تونەیە، جارا پێشین کور دچە ناڤ بۆستانێ دێوێ سۆر. کەچا دێو دبە ئەڤینداریێ سلێمانێ زندی، دبە ئالیکارا وی. ئەو زەبەشێ دیبیا وی گۆتبوویێ، پەیدا دکە، ڤەدگەرە مالێ. دیبیا وی و هووت ڤێ جارێ لیستکەکە دن تینن سەرێ سلێمانێ زندی، دیبیا وی دبێژێ، هەرە من رە «شیرێ شێر د عەیارێ شێر دە» بینە. سلێمان لێ دخە دچە چییایێ شێران. کەچا دێو دیسا ژێ رە دبە ئالیکار، دبێژە دەما تو دچی چییایێ شێران ل ور خووشکەکە من هەیە ناڤێ وێ گولخانە، ڤێ نامێ بدە وێ، ئەوێ تەرە ببە ئالیکار. ڤێ جارێ ژی سلێمانێ زندی داخوازییا دیبیا خوە تینە جیە. لێ بەلێ ژ بەر کو دیبیا وی کەسەکە بێبەخت و خایین بوویە، د داوییێ دە چاڤێ کورێ خوە دەردخە و داڤێژە بیرەکێ (چال). پاشێ ئەو ب ئالیکارییا چەند رێوییان تێ خەلاس کرن. ڤێ جارێ سلێمانێ زندی تێ مالێ، هەم دیبیا خوە، هەم ژی دوستێ وێ دکوژە، پاشێ ژی لاشێ وان دشەوتینە، سلێمانێ زندی خوە ژی ب کەچا دێوێ سۆر رە دزەوجە، ناڤێ وێ هەردەمخان بوویە. پاشێ ئەو دچن مرازێ خوە دبن. د چیرۆکا سلێمانێ زندی دە دوبەندیکە گەلەک تووژ هەیە، ل ئالیکێ داییکەکە دل ب کەڤر، بێبەخت، ل ئالیکی ژی هەردو کەچێن دێوێ سۆر (هەردەمخان و گولخان) ب قەنجییا خوە ڤە تێن ناسین، وەک دو تیپێن ل دژی هەڤ، ژ هەڤ دوور،

بوونە نیشانا پاکی و نەپاکیییێ. ب ڤان هەردو تیپێن ژنان ڤە، چیرۆکێ ئیمکانەکە رووبەری هەڤکرن، دانبەرهەڤدانێ ژ بۆ خوەندەڤانان پەیداکریە. د چیرۆکی دە ژنێن چیرۆکی د وارێ قەنجییێ دە چاوا ئەم دبینن زۆرا ژنێن مرۆڤی (بەنی ئادەم) دبن. ب ڤێ تەکنیکا خوە ڤە چیرۆکەکە ب هێزە. ئەڤ چیرۆکا کو رۆجەر لیسکو بەرەڤ کریە (سلێمانێ زندی)، ژ گەلەک ئالییان دە دشبینە چیرۆکەکە کو حەجییێ جندی بەرەڤ کرییە (مەیموون خانم و میرزە مەحموود)، دڤێ چیرۆکێ دە ژی دیییا میرزە مەحموود، دێوەکی ب ناڤێ بابر رە دبە یەک، ل دژی کورێ خوە خرابییا دفکرە، هەردو چیرۆک ژی خرابی و دلکەڤرییا داییکێن بێبەخت رادخە بەر چاڤان[٥٠]. چیرۆکا (شاروور بلبل) دە میرزە مەحموود راستی کەچێن دێوێن سۆر، سپی و رەش تێ، ئەڤ هەرسێ کەچک ژی وی رە دبن ئالیکار و دبن ئەڤینداری وی، لێ بەلێ میرزە مەحموود هەتا ناگهێژە مەرەما خوە، تێکلی ڤان کەچکان نابە، شوورێ خوە داتینە ناڤبەرا خوە و وان[٥١]. ژ بەر کو د ڤان چیرۆکان دە دێو، حووت، جن ب خرابییا خوە ڤە تێن ناسین، ل پێشبەری ڤان زۆردەستییێن باڤێن خوە، کەچێن وان ژی بوونە وەک نیشانێن ئاشیتییێ، ئەڤین و قەنجییێ. دژایەتیکە مەزن ناڤبەرا باڤ – کەچان دە هەیە. د چیرۆکێن ل سەر پادیشاهان دە ژی، چاوا مە گۆتبوو دژایەتییا باڤ – کەچان ب ناڤ و دەنگە. د چیرۆکا (نێچیرا چییایێ رەش) دە هەم دلێ کەچا پیرا هەفتسەری دکەڤە میرزە محەمەد، هەم ژی دلێ دەرگستییا دێوێ جانپۆلات. هەرچقاس دەرگستییا دێوێ جانپۆلات دخوازە وەکی میرزە محەمەد ببە مێرێ وان هەردوویان ژی، لێ بەلێ ئەو ڤێ یەکێ جیە دە نابینە، میرزە محەمەد ب کەچا دێوێ جانپۆلات رە دزەوجە، ناڤێ وێ گولسووم بوویە، کەچا پیرا هەفتسەری ژی ددە براکێ خو [٥٢].



ئەڤ کەچان ب ڤێ ئەڤینا خوەڤە، ئەم دکارن بێژن کو ئەو ب تەحرەکی مایین نەحەقی و زۆردەستییان ل وەلاتێ خوە، زۆردەستییێن باڤان پرۆتەستۆ دکن. ئەڤێن، دبە فۆرمەکی پرۆتەستۆیێ.

بەشێن داوین یێن چیرۆکێن کوردی تمێ هەقی، قەنجی، پاقژییێ وەک مۆتیفێن دلپاکییێ ل سەر مرۆڤان دە دبارینن. د چەند چیرۆکێن کوردی دە، جارجار ئەو کەسێن کو هاتنە گرتن، ئەزییەت و جەفا دیتنە، نەپاکی هاتنە سەرێ وان، مێرخاسێ چیرۆکێ یێ خێرخواز ڤان کەسان دشینە حمامێ وەکی خوە حمام بکن، بشۆن، ئەڤ مۆتیفا حمامێ وەک نیشانا پاقژیێ دکارە بێ حەسبین. نەتەنێ قلێر و قرێژا بەدەنێ، ئەڤ سەرشوشتنا ژ ئالیکی دە ژی دبە نیشانا سەرکەتن، سەربەستی و شاهیێ، مۆتیفا حمامێ دبە نیشانا دەستپێکا ژییانەکە نووە.

## تەکۆشین و کەفتەلەفتا ژنان

ب کورتی تەما ژنان دناڤ چیرۆکێن کوردی جیهەکی فرەهـ دگرە. دەما ئەم ڤان چیرۆکان ب چاڤەکی رەخنەگری ئانالیز دکن، ژن د ڤی واری دە گەلەک ئاکتیفن. ژ ئالیکی دە ئەو ب خورتی ل دژی نەهەقییێن ل وان بوویی، رادوەستن، شەر دکن، ژ ئالیکی دە ژی وەک پێشەنگ و رێبەر ب زانەبوون و فامدارییا خوە ڤە رێ نیشانی مێران ددن، د ناڤ چیرۆکان دە مۆتیفا ژنێن تەکۆشەر پەیدا دکن. ئەو تەڤی رابەرزینێن «ژن تابعێ مێرە ئان مێر تابعیێ ژنە» دبن، ئەو د چەند چیرۆکان دە ئیسپات دکن، نیشان ددن کو، تمێ «ژن نە تابعیێ مێرە»، ئەو گەلەک هەول ددن کو نیشاندن وەکی مێر ژی دکارن تابعێ ژنان بن. چاوا تێ زانین کارێن کو ژن د ناڤ

مالێ دە دکن بێهەژمارن، نە تەنێ کارێن مالێ. ل دەر مالێ ژی ژن تمێ مژوولن، د وارێ بجیهئانینا کارێن دەر و هوندر دە سەبرا ژنێن کورد بێسینۆرە. د چیرۆکا (مێر نەشێن بێن کەڤانی) دە دەما زلامەکی جۆتکار ب ژنا خوە ڤە پەڤ دچە، مرووزێ خوە دکە وەکی شیڤ تونە، رۆژەکی ژن دبێژێ دە وەرە تو ب کارێن مالێ ڤە مژوول ببە، ئەز ل شونا تە هەرم جۆت، دەما ژنک ئیڤارێ ڤەدگەرە مال، مێزە دکە کو مالوێرانی. مێرێ وێ پۆشمان دبە، رۆژترا دن دیسا دچە ل سەر جۆتێ خوە[٥٣]. د چیرۆکا (قرخ ساچلییێ) دە ئەم راستی ژنەکە وسان تەکۆشەر تێن. ئەو تەرکەسەری دنێ دبە، د رێ دە راستی گەلەک کەسان تێ، ئەڤ کەسان چاڤ بەر ددن وێ، دخوازن ب وێ رە بزەوجن، دەست داڤێژنە وێ، لێ بەلێ قرخ ساچلی هەر جارەکێ رێکێ دبینە، پێسیرا خوە ژ ڤێ کۆما مێران وان خەلاس دکە. جارەکی راستی پادیشاهەکی تێ، سی و نەهـ ژنێ وی هەبوونە، دخوازە قرخ ساچلییێ ژی بخوازە، ژنێ خوە بکە چلی. قرخ ساچلی، پادیشاهـ دخاپینە و سی و نەهـ ژنێن وی ژی هلددە دەرڤە، دچە. ڤێ جارێ راستی کۆمەکا چل مێران تێ. ئەڤ چل مێرە دخوازن، ب ڤان کەچان رە بزەوجن. قرخ ساچلی، ب کەچێن هەڤالێن خوە ڤە، لێ دخن کۆکا ڤان چل مێری تینن، پاشێ دکەڤنە رییا خوە. رۆژەکێ تێن جیهەکی دبێن کو پادیشاهێ وی وەلاتی مرییە، تەیرێ دەولەتێ دفرینن، ئانگۆری عەدەتێن وان سالان، تەیر سەرێ کێ دانییا، ئەو دبوو پادیشاهێ وی وەلاتی. ڤێ جارێ تەیرێ دانینە سەرێ قرخ ساچلییێ، قرخ ساچلی دبە پادیشاهـ، وان سی و نەهـ کەچکێن دن ژی دکە وەزیر، وەکیل و کارێن مایێن ددە وان، مەجلیسەکە تەنێ ژ ژنان پێکهاتی ئاڤا دکە، د داوییا چیرۆکێ دە، ئەو کەسێن کو بەرێ د رێ دە راستی وێ هاتبوون، دەست ئاڤێتنە وێ، ئانگۆری کرنێن وان قرخ ساچلی تینە جەزایان ددە وان، کەسێن ب هەق و نەهەق ژ هەڤ



جودا دکە[٥٤]. چیرۆکا قرخ ساچلییێ نیشان ددە کو ژن دکارن د هەڤێ هەر تشتی دە دەرکەڤن، سەرکەڤن و بگهێژن سەرفرازییێ. د چەند چیرۆکێن کوردی دە ئەم راستی ژنێن وسان تێن کو ل دژی دژمنێن خوە سەفەربەر دبن، کارێن خوە ب سەرفرازی دقەدینن، دگهێژن ئارمانجێن خوە[٥٥]. چەند چیرۆکێن کوردی ژی ژن هەنە، نیشان ددن کو ژن دکارن گەلەک جاران لیستکێن مەزن بینن سەرێ مێران، ل سەر تلیکە خوە ڤان مێران بدن لیستنێ. د چیرۆکێن (ژنا بێتەر)[٥٦] و (ماسییێن بەژی)[٥٧] دە، ئەم راستی ژنەکە وسان تێن، دکارە مێرێ خوە بدە باوەرکرن وەکی د ناڤ زەڤییان دە ژی ماسی دکارن پەیدا بن و مێر ژی باوەر دکە. بێتەرییا ژنان جارجار دگهێژە سینۆرەکی وسان، مرن ژی ب وان نکارە. دەما ڤان تیپێن ژنان تشتەک خستە هشێ خوە، ئانگۆری چیرۆکان خوەدێ ژی ب وان نکارە، ئەڤ ژن د ناڤ کۆما ژنێن سەرهشک دە جیهـ دگرن. رۆژەکێ مێرەک و ژنا خوە دچن ناڤ زەڤییێ، دنێرن کێرکوشکەک ژ ناڤ زەڤییێ رەڤی چوو. ژنک دبێژە، ئەو رووڤی یە، مێر دبێژە نا ژنک ئەو نە رووڤی یە، ئەو کێرگوشکە. مێر چ دکە – ناکە نکارە ژنا خوە بدە باوەرکرن، دچن گۆرا ژنێ دکۆلن، ژنک دیسا دبێژە، نا ئەو رووڤی یە[٥٨].

ب کورتاهی د چیرۆکێن کوردی دە هەرچقاس ل پێشبەری مراز، بەخت و دلشاهییا ئەڤینداران گەلەک دژواری، تەنگاسی و ئاستەنگ پەیدا دبن ژی، ئەو دیسا ب سەرفرازی ڤەدگەرن تێن، دگهێژن هەڤ. ب تایبەتی ژن ژ بەر ڤان دژواری و تەنگاسییان تو وەخت ستوویێ خوە خار ناکن، تمێ ئاکتیفن. د گەلەک چیرۆکان دە ئەو تینن حوورێ راوران دخن سەرێ خوە، دکەڤنە دلقێ کەچەلان، ژ بەر کو کەس شکێ نەبە وان، ئەو هەر ئیمکانێن خەلاسییێ دجەربینن. مۆتیفا «ژنا کەچەلۆک» ژ ئالیکی دە ئاکتیڤبوونا ژنان نیشان ددە[٥٩]. د ڤێ کەفتەلەفت، شەڕ و تەکۆشینا خەلاسییێ دە،

چەند هێزێن چیرۆکی ژی تمێ ئامادەنە، تێن هەواربیا ئەڤینداران، کەچ – خۆرتان، ئالیکاربیا وان دکن، وەک سەجادە، خالیچێن فرۆکە، تەیرێ سیمر، شڤا قودرەتێ، ژن ئان ژی کەچا دێو(٦٠). ئەڤ یەکتی، دەستبراکی و دۆستایەتی، چاوا ئەم دبینن وسان خورتە، کو د داوییێ دە، زۆرا وی دێوێ هەری خورت، جانپۆلات ژی دبە، هەفت دەرییێ وێ یێن پۆلا ژی ئێدی کێری تشتەکی نایێن، وەک مێرێ رۆژێن تەنگ میرزە مەحموود چاوا وێ کەچکا بەدەو چلکەزییێ ژ دەستێ جانپۆلات خلاس دکە، چلکەزییێ دگهیینە مرازێ وێ، ئەم دبینن کو داوییا هەر چیرۆکەکێ دە مزگینییا شاهییێ ب لەز دچە دگهێژە دێ – باڤان، مرۆڤ دکارە بێژە کو داوییا هەر چیرۆکەکێ دە دیلانەک هەیە[٦١]. مۆتیفا میرزە مەحموود د چیرۆکێن کوردی دە وەک خەلاسکارێ ژنێن بندەست یێ هەری ب ناڤ و دەنگ دکارە بێ حەسبین. د چیرۆکا (یوسفێ تەنبوورڤان)دە پشتی گەلەک تەقەرەقان گولبارین ژ دەستی جانپۆلات تێ خەلاس کرن، هەرچقاس جانپۆلات ب لێدانان نایێ کوشتن، د داوییێ دە روحێ وی ژێ تێ ستاندن، پاشێ ئەو بێجان دمرە. گولبارین پارا یوسفێ تەنبوورڤان دکەڤە[٦٢]. د چیرۆکاکە مایین دە ڤێ جارێ کەچەکە مایین تێ خەلاس کرن، ناڤێ وێ بلبل هەزار بوویە[٦٣]. وەک ڤان کەچێن بەدەو وەک چلکەزی، گولبارین، بلبل هەزار .... گەلەک کەچێن مایین ژ بەر دەستێ دێوان، حووتان دفلتن، دگهێژن بەخت و مرازێ خوە. ب کوورتاهی مرۆڤ دکارە بێژە کو پرسا خەلاسی و ئازادییا ژنان، کاکلێ پرانییا چیرۆکێن کو ل سەر بابەتا زەواج و ئەڤینێ هاتنە گۆتن، پێک تینە.



## چاڤکانی

١- چاوا بەری و پشتی دەستپێکا سەد سالا مە، وسان ژی د سالێن داوین دە چیرۆکێن کوردی بالا گەلەک کوردناس و لێکولینەران کشاندییە سەرخوە. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی، وان ئەڤ بەرهەمان وەرگەڕاندنە چەند زمانان: م. ب. رودەنکۆ، Kurdskie Skaski ، مۆسکۆڤ، ,١٩٥٩ جەمال نەبەز، Kurdische Mårchen und Volkserzählungenعارەب شامیلۆ ، مونیه، ,١٩٧٢ .Arab Schamilow, Die drei, calatzköfte Berlin, 1977. Joyce Blau, contes Kurdes, Paris, 1986. Kurdische Volksmârchen Kurdiskie Skazki, ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل و زینا جەلیل، Legendii Predaniya, Moskov, 1992. Muhsine Helmo,

Cigaramin Üstünde Bir Topal karinca - Türkçe‘ de Îlk Kez 88 yeni Masal, Ankara, 1992

(پرانییا چیرۆکێن کو د ڤێ بەرەڤۆکێ دە جیه گرتنە، ل دەڤەرێن کوردستانێ یێن جودا هاتنە بەرەڤ کرن). Der Löwe des Daragnos und andere Kurdische Fabeln, wien, 1992.

٢- رۆجەر لیسکو، چیرۆکێن کوردی، ستۆکهۆلم، ١٩٨٦، رووپ ٦٨ – ١٠٥ .

٣- رۆجەر لیسکوت، رووپ ٦٨ – ١٠٥، ١٠٦ – ١٤٠ .

٤- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ III، ئەریڤان، ١٩٦٩، رووپ. ٧١ – ٨٣ . (ئەڤ خەباتا حەجییێ جندی ژ پێنج جلدان پێکهاتی یە، هەر جلدەکی دە گەلەک چیرۆکێن کوردی جیه گرتنە، د ناڤ خەباتێن کو هەتا نها هاتنە پێکئانین دە، خەباتەکە هەرە بەرفرەه و گرانبهایە. بەرەڤکرنا ڤان چیرۆکان قاسی بیست و پێنج سالێن نڤیسکار گرتیە. جلدێ یەکەمین د سالا ١٩٦١، ان دە هاتییە

وەشاندن، جلدێ پێنجا و داوی. د سالا ١٩٨٦ ان دە دەرچوویە).

٥- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ IV، ئەریڤان، ١٩٨٠، ١٩٨٠، رووپ. ٧٢ - ٧٤ .

٦- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا II.رووپ. ٢٢٩ - ٢٣١ .

٧- زەینەل عابدین زنار، خوەنچە I، ستۆکهۆلم، ١٩٨٩، رووپ. ١١٦ - ١١٩ .
(زەینەل عابدین زنار ژ سالا ١٩٨٧، ان ڤـر دە هەتا نها شەش جلدێن خوەنچە وشاندنە. د هەر بەشەکە جلدەکی دە گەلەک چیرۆکێن کوردی جیھ گرتنە، هەموو ل ستۆکهۆلمێ هاتنە وەشاندن. جلدێ داوی ١٩٩٣،ێ دە دەرچوو).

٨- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ I، رووپ ٢٠١ - ٢١٠، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ IV، رووپ. ١٧٣- ١٧٥ .

٩- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ IV، رووپ. ١٩٨ - ٢٠١ .

١٠- م. ئەمین بۆز ئارسلان، ماسییێن بەژی، ئۆپسالا، ١٩٨٧، رووپ ٢٨ - ٢٩ .
(م. ئەمین بۆز ئارسلان هەتا نها گەلەک پێکەنۆکێن گەلی وەک پێنج پرتووکان وەشاندییە: ماسییێن بەژی ١٩٨٧، ژ دینا دینتر ١٩٨٨، عیلێ توورک ١٩٨٩، بووکا گولسوون ١٩٩٠، مەلا کولی ١٩٩١).

١١- حەسەنێ مەتێ، ئارد و (ژ کورتە چیرۆکێن گەلێری)، ستۆکهۆلم، ١٩٩٠، رووپ ١٠٤ - ١٠٦ .

١٢- م. ئەمین بۆز ئارسلان، ماسییێن بەژی، رووپ ٤٨ - ٤٩ .

١٣- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا II، مۆسکۆڤ، ١٩٧٨، رووپ. ٢٦٠ - ٢٦٧ .

١٤- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، گولانچکزێرین (بەرهەڤۆکەکە فۆلکلۆرک)، ئەریڤان، ١٩٨٤، رووپ ٨٢٠ - ٨٨ .

١٥- م. ئەمین بۆز ئارسلان، مەلا کولی، رووپ ٢٨ - ٦٤ .



١٦- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ IV، رووپ. ٤٧ - ٤٩ .

١٧- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ III، رووپ. ٩ - ١٩ .

١٨- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارۆگۆتنا کوردا،II ، رووپ ٢٠٥ .

١٩- زارۆگۆتنا کوردا،II ، رووپ ٢٣٥ - ٢٣٧ .

٢٠- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ. IV، رووپ. ٥٢ - ٥٤ .

٢١- زەینەل عابدین زنار، خوەنچە II، رووپ. ٢٨١ - ٢٨٢

٢٢- م. ئەمین بۆز ئارسلان، پەپووک، ئۆپسالا، ١٩٨٥، رووپ. ٥٣ - ٦٦ . (م. ئەمین بۆز ئارسلان ئەو چیرۆکێن کو ل سەر راوران هاتنەگۆتن، وەک پێنج پرتووکان وەشاندییە، وی ئەڤ چیرۆکان ب «مەسەلۆکێن لاوران» ناڤ کرییە: میر زۆرۆ ١٩٨١، کورێ بلوورڤان ١٩٨٢، کێزخاتوون ١٩٨٢، سەرکەتنا مشکان ١٩٨٤، پەپووک ١٩٨٥).

٢٣- سەلیم، باکشک، سوریەیار، رۆژناما ئازادی، ئیستەنبۆل، ٢٥ - ٣١-٧- ١٩٩٣ .

٢٤- م. ئەمین بۆز ئارسلان، بووکا گولسوون، رووپ. ٧٠-٨٢ .

٢٥- زارگۆتنا کوردا، II، رووپ ٢٠٩٠ .

٢٦- بۆز ئارسلان، عیلێ توورک، رووپ. ١٩ - ٢٢ .

٢٧- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، گولانچکزێرین، رووپ. ١١٤ - ١٣٠ .

٢٨- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ III، رووپ. ٢٠٣ - ٢٠٧ .

٢٩- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ III، رووپ. ٨٤ - ٩٥ .

٣٠- زەینەل عابدین زنار، خوەنچە I، رووپ. ٢٤٧ - ٢٤٨ .

٣١- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ IV، رووپ. ١٢٣ - ١٢٤ .

٣٢- زەینەل عابدین زنار، خوەنچە VI، رووپ. ١٥٥ - ١٦١ .

٣٣- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ IV، رووپ. ٤٤ - ٤٦ .

٣٤- م. ئەمین بۆز ئارسلان، ژ دینا دینتر، رووپ. ٩ - ١٠ .

٣٥- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، گولانچکزێرین، رووپ. ٥١ .

٣٦- حەسەنێ مەتێ، ئاردو، رووپ. ٧١ - ٧٣ .

٣٧- م. ئەمین بۆز ئارسلان، ژ دینا دینتر، رووپ. ٢٣ - ٢٤ .

38) Major E. B. Soane and Bazil Nkitin, The Tale of Suto and Tato, Londun, 1988 .

(ئەڤ چیرۆکا بەری گەلەک سالان ژ ئالییێ ڤان هەردو کوردناسان دە ب زمانێ ئینگلیزی هاتییە چاپ کرن. دڤێ چاپا نووە دە ل گەل چاپا ئینگلیزی، چیرۆک ب هەردو زاراڤایێ کوردی کرمانجی - سۆرانی ژی هاتییە وەرگەڕاندن).

٣٩- حەسەنێ مەتێ، ئاردو، رووپ. ١١٨ - ١٢١ .

40) Alexandêre Jaba, Recuel de notices et de recits Kourdes, st. ptersbourg, 1860 .

٤١- م. ئەمین بۆز ئارسلان، پەپووک، رووپ. ١٩٨٥ .

٤٢- زەینەل عابدین زنار، خوەنچە II، رووپ. ١٨٥ - ٢٣٧ .

٤٣- زەینەل عابدین زنار، خوەنچە IV، رووپ. ١٤٥ - ١٥٢ .

٤٤- م. ئەمین بۆز ئارسلان، کێز خاتوون، رووپ. ٥٨ - ٧٦ .

٤٥- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ IV، رووپ. ٨٧ - ٩١ .

٤٦- ئا. گەرناس، حەمەند II-I، رۆژناما ئازادی، ئیستەنبۆل، ٦-١٢/٢/١٩٩٣ ، ١٤-٢٠/٢/١٩٩٣ .

٤٧- رۆجەر لیسکو، چیرۆکێن کوردی، رووپ ٩٤ .

48) Muhsine Helimoglu, Cigaramin Üstünde Bir Topal Karinca, Ankara, 1992, rûp. 24.

٤٩- زاهیر کایان، د چاندا مە دە مۆتیفا شاهمارانێ، رۆژناما وەلات، ئیستەنبۆل، ١٢-١٨/٩/١٩٩٣ .

٥٠- رۆجەر لیسکو، چیرۆکێن کوردی، رووپ. ٣٨-٦٧ . حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ I، ٢١١-٢٢٧ .

٥١- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، چیرۆکێد جماعەتا کوردا، ئەریڤان، ١٩٧٤، رووپ . ١٠٦-١٣٧ .

٥٢- زەینەل عابدین زنار، خوەنچە VI، رووپ. ١٨٩ - ٢٠٩ .

٥٣- م. ئەمین بۆز ئارسلان، ژ دینا دینتر، رووپ. ٣٠ - ٣٢ .

٥٤- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، چیرۆکێد جماعەتا کوردا، رووپ. ٢١-٤٢

55) Alexandere Jaba, Recueil de notices et de recits Kourdes, st. ptersbourg, 1860 .

٥٦- زارگۆتنا کوردا II ، رووپ. ٢٣١-٢٣٢ .

٥٧- م. ئەمین بۆز ئارسلان، ماسییێن بەژی، رووپ. ٦٠ - ٦٤ .

٥٨- زارگۆتنا کوردا II ، رووپ. ٢٢١ .

٥٩- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ II، رووپ. ٧٢ - ٧٨ .

٦٠- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ V، رووپ. ٩٨ - ١٠٦ .

٦١- حەجییێ جندی، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ I، رووپ. ١٧ - ٤٢ .

62) Stig Wikander, Recueil de textes Kourmandji, rûp. 24-32 .

63) Stig Wikander, Recueil de textes Kourmandji, rûp. 35-38 .

## د گۆتنێن پێشیيا ده ئانالیزەکه زیهینییەتێن ژنپارێز

گۆتنێن پێشیيا بەشەکه گرنگ یا فۆلکلۆرا کوردی پێک تینن. ژ ڤان گۆتنان ره جارجار پەندێن پێشیيا ژی دبێژن. ئەڤ بەرهەمان جارجار ژی مەسەله و مەتەلۆک تێن ب ناڤ کرن. گۆتنێن پێشیيا یێن کوردی گەلەک دەولەمەند و رەنگینن، ژ وانان بەشەک شاخێن وان یێن جودا ژی هەنه. هەتا نها هەموو گۆتنێن پێشیيا د ناڤ کوردان ده نەهاتنه بەرەڤکرن، نه هاتنه شرۆڤەکرن و ل سەر وان خەباتێن زانستی و فۆلکلۆریک زێده نەهاتنه پێکئانین. دڤی واری ده خەباتەکه هەره فرەهـ د سالا ١٩٨٥، ان ده ژ ئالییێ پرۆفیسۆر حەجییێ جندی هات وەشاندن، د ناڤ ڤێ بەرەڤۆکا کو ب ناڤێ مەسەلۆک و خەبەرۆکێد جماعەتا کورد هات چاپکرن، ژ بیست و پێنج هەزار زێتر گۆتنێن پێشیيا جیهـ گرتن.[1] ئەڤ بەرەڤۆکا د ڤی واری ده خەباتا هەره فرەهین تێ حەسبین. ژ دەر ڤێ خەباتا حەجییێ جەندی، چند خەباتێن هەردو بران ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل د ڤی واری ده هەنه،[2]. د ڤان سالێن داوین ده، ل ترکییێ ژی چەند پرتووکێن گۆتنێن پێشیيا ژ ئالییێ حوسەین دەنز[3] و ئا. بالی[4] هاتن وەشاندن. ژ ئالییێ دی، چەند بەرهەم و لێگەرین چاوا ئەم دبینن ب سەرێ خوە بەرەڤۆکێن گۆتنێن پێشیيا نین بن ژی، د ناڤ رووپەلێن ڤان ده گەلەک گۆتنێن پێشیيا هاتنه وەشاندن ئان ژی زانیاریێن کورت ل سەر گۆتنێن پێشیيا هەنه[5] .



گۆتنێن پێشیيا وەک نەینکا فەلسەفەیا ژیینا گەلێ کورد گەلەک زانیاری و ئاگاهدارییێن گرانبها پێشکێشی مە دکن. ب تایبەتی د وارێ پێوەندییێن جڤاکی و مرۆڤی ده، ئەڤ گۆتنێن کورت، تێر – تژی و مەناکوور، مە رۆنی دکن و شیرەتا ل مە دکن. کوردان ب کیژان فەلسەفایا ژیینێ ڤە ل دۆربەرێ خوە، ل جیهانێ نهێرینه؟ باشی – نەباشی، پاکی – نەپاکی وراستی – نەراستی ب چ ئاوایی ژ هەڤ هاتنه جودا کرن؟

وەک ڤان پرسان مرۆڤ بەرسیڤێن گەلەک پرسێن مایین ژی ب ئالیکارییا گۆتنێن پێشیيا، ب ئاواکی گەلەک کورت دکاره بدە. جڤاتێ ب خوە قیمەتێ گۆتنێن پێشیيا دایە: گلییێ پێشیيا، کەڤرێ خانییا.

د ناڤ گۆتنێن پێشیيا یێن کوردی ده، بەشەکه وان چاوا ئەم دبینن ل دۆرا تەما ژنان بەرەڤ و لۆد دبن، ب سەدان گۆتنێن ل سەر ژنان د زمانێ کوردی ده هەنه. ئەڤ لۆدا گۆتنێن پێشیيا دەربارەیی رەوشا ژنان ده، گەلەک ئاگاهدارییێن سۆسیۆلۆژیک پێشکێشی مە دکن. ب سایا ڤان گۆتنێن پێشیيا مرۆڤ خوە ب هێسانی درێژی سەربۆرییا جڤاتا کورد ژی دکە، پێوەندییێن ژن – مێران، رەوشا مالێ، مالبات و ژنێ چێتر ئانالیز بکە. ب ڤی تەحری، ئەم ڤان بەرهەمێن فۆلکلۆریک ژ خوە رە دکارن بکن پێلەکان و ل سەر رەوشا ژنێن کورد بگهێژن چەند ئەنجام و نێرینێن سۆسیۆلۆژیک – ئەتنۆگرافیک، دیسا بسایا ڤان گۆتنان ئەم دکارن خوە وەک جڤات باشتر بناسن و بدن ناساندن. ئەو وەک نەینکەکێ نە، ب هەر ئالییان ڤە دکارن جڤاتا کوردی بینن ل بەر چاڤان. بێگومان هەر گۆتنەکە پێشیيا یەکتەن ژ دەڤێ یەکی/ یەکێ ژ نشکا ڤە دەرنەکەتییە. هەر گۆتنەکە پێشیيا، سەرپێهاتی و چیرۆکەکە وێ هەیە، د داوییا بوویەرەک گرنگ ده پەیدا بوونە، پێویستی و حەوجەداریکێ ئەو ئەفراندنه. دەما ئەم

زێدە تەجروویە و جەرباندنێن مرۆڤان یێن سەد سالە ژی، ل سەر ڤان ئەتابان دە زێدە بکن، وێ چاخێ مرۆڤ دبینە کو هەر گۆتنەکە پێشییا ل سەر بنگەهێن کەد و زەحمەتەکی ئاقلمەندییێ پەیدا بوویە، فۆرما خوە یا داوی وەرگرتییە[٦].

هەر گۆتنەکە پێشییا ل سەر ژنان، راستە - راست رەوشا ژنان تینە زمێن. بەشەک ژ وان ژی، رەوشا ژنان دانە بەرچاڤان، لێ بەلێ ل سەر تشتێن مایین هاتنە گۆتن و وان تینن زمێن، ژ بەر کو ل سەر تەما ژنان شاخ ڤەدانە و ژن ژ خوە رە کرنە بنگەه، ئەڤ بەشا دووەمین یا گۆتنێن پێشییا دیسا ژی بالا مرۆڤان ڤەدگەرینن ل سەر رەوشا ژنان، وەک میسال دەما مرۆڤ دبێژە قیز مێڤانێ مالێ یە، مرۆڤ دخوازە بێژە کەچەک نکارە هەتا مرنێ د مالێ دە بمینە، ژ ئالییێ دن ژ بۆنا تشتێن دەربازۆک ژی مرۆڤ دکارە ڤێ گۆتنا پێشییا بکار بینە. دەما مرۆڤ تەنێ ڤێ مانا دووەمین بدە بەر چاڤان، کۆک و بنیاتا پەیدابوونا ڤێ گۆتنێ مرۆڤ نکارە (وەک رەوشا کەچان) باڤێژە ئالیکی. ئەڤ کۆک و بنیاتێن چەند گۆتنێن پێشییا ژی، بۆنا رۆنیکرنا ڤێ ئانالیزا مە یا ل سەر ژنان گەلەک رێنیشاندار و کێرهاتی بوونە. ژ ئالییێ دن، ژ دەر گۆتنێن پێشییا، ژ بۆ خورتکرنا چەند نێرین و باوەرییێن خوە، مە ژ فەرهەنگا هەڤبێژەیێن (تەعبیر) کوردی ژی گەلەک ئیستیفادە کر[٧]. د ناڤ هەڤبێژییێن کوردی دە، گەلەک هەڤبێژەیێن دەربارەیی ژنان هەنە، وەک گۆتنێن پێشییا رێ نیشانێ مە ددن. هەژمارا گۆتنێن پێشییا یێێن کوردی ب سەدانن[٨] ل هەر هەرێمێ ئانگۆری زاراڤ و دەڤۆکان شاخ و گوهارتۆکێن وان ژی هەنە. هەمبەریهەڤکرن، دانبەرهەڤینا وان بێگومان گەلەک بالکێش و کێرهاتی یە، خەباتەکە وسان دکارە گەلەک زانیاری و ئاگاهدارییان دەرخە هۆلێ، لێ بەلێ ئەڤ یەکا خەباتەکە ب سەرێ خوە یە.



## ژن کانییا ژیینێ یە

ژ ناڤ گۆتنێن پێشییا یێن کوردی دە دەما مرۆڤ مۆتیفێن زیهنییەتێن ژنپارێز (پرۆ-ژن) هلدچینە، گۆتنا کو بالا مرۆڤ زێتر دکشینە ل سەر خوە، بێگومان گۆتنا ژن کانییا ژیینێ یە. گەلۆ جڤاتا کوردی چاوا خوە گیهاندییە ڤێ باوەرییێ؟ ژ بۆ پەیدابوونا نفشێن نووه و بەردەوامبوونا مرۆڤاتییێ، ب ئانینا زارۆکان ڤە، ژن وەک فاکتۆرەکی پرۆدوکتیف، ئادان و فێکیدار هاتییە حەسبین. ب ئانینا زارۆکان، ژن بوونە نیشانا بەرەکەتێ، وان تام - لەزەتەکە نووه دایە ژیانێ. وان مرۆڤاتی ژ وندابوونێ خەلاس کرنە، ئانینە ڤێ رۆژێ. دەما مرۆڤ مالباتێن کوردی یێن پڕ - زارۆک ددە ل بەر چاڤان، ئەو حەزکرنا زارۆکان، وەک ئەڤین شقتییە ل سەر ژنان. ئەڤ ژنێن پڕ زارۆک، ژ ئالییێ جڤاتێ دە ئاوا هاتنە ناساندن: ماکا نۆدک نۆد جانوویی. ب ڤی تەحری ژنان، ئانگۆری جڤاتێ خەملەک دایە ژیانێ، ژیان نەقشاندییە. ئەڤ حورمەتا ل دۆر ژنان بەرەڤ و تیر دبە، د گۆتنەکە دن دە دگهێژە دەرەجەکە بلند: ژن بەدەوییا عەمرە، بێگومان ئەڤ گۆتنێن زێرین، جیهێ ژنان د جڤاتا کوردی دە ب شەمال و ب تیرەژەکە گەلەک تووژڤە رۆنی دکن، سەر بلندی و روومەتا ژنان زێتر دبرقینن، نیشان ددن. ئانینا زارۆکان ژ ئالییێ ژنان دە پێشکێشەکە هەرە مەزن هاتییە حەسبین، زارۆک پارچەک ژ جانێ خوە حەساب کرنە. ڤێ یەکێ هیسێن مەرحەمات، دلشەوتی، دەستڤەکرییێ، پاراستن و دلۆڤانییێ ل بال ژنان زێتر کرییە. ڤێ رەئالیتێ، ژن ب مالێ ڤە گرێ دایە: ژنا بێ زار دلێ وێ ناشەوتە مالێ. هەتا مرنێ ژی، پەی زارۆکێن خوە دکەڤن. ب کورتی، وەک گۆتنەکە مایین دبێژە: ژن سەبرە.

د جڤاتا کوردی یا ئیرۆیین دە جار جار دبە مرۆڤ راستی رێچ و شۆپا

ڤان پەیڤێن دەلال نەیێ، ژیین دکارە مرۆڤ دلسار و رووسار بکە، لێ بەلێ تەڤ ڤان گۆتنێن پێشییا، فۆلکلۆر تەنێ شیرەتا مە دکە، رییێن جیهانەکە دلشا و شانەشین نیشانی مە دکە، وەک بیر - باوەری دمینە: بەرێ تەختەیا ژنان بوویە. ئەڤ گۆتنا پێشییا ژ ئالیکی دە خرابییێت جڤاتا ئیرۆ، کێماسییێن ناڤبەرا ژن - مێران رەخنە (کریتیک) دکە، ژئالیکی دە پرێن دوھ - ئیرۆ - سبێ ب تەحرەکی فۆلکلۆریک ئاڤا و خورت دکە، ژ ئالییێ دن ڤە گۆتنا پێشییا دەربارەیی لێکۆلینا بنگەهێن مالباتێن مادەرشاهی (ژن حاکم - داییک حاکم) دە ژی، دەریکێ ل پێشییا مە ڤەدکە، ژ مەرە دبە ئالیکار.

کورد زێتر چ حەز دکن؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ د ناڤ رۆمانتیکییا کوردان دە ڤەشارتییە: کورد ژ گشکا زێتر ژنا خوە، هەسپا خوە و چەکا خوە حەز دکە. گۆتنەکە مایین ڤێ گۆتنا پێشین هن ژی زەلالتر دکە: مێرێ کورمانج گاڤا تێر خوار یا مرۆڤان دکوژە، یا ژنەکێ درەڤینە. هەموو ئەڤ گۆتنان، بەشەکی فۆلکلۆرێ ژی پێک بینن، دیسا ژی وەک خەملێن ژنپارێز، دەربارەیی «سیارێن رۆژهلاتێ» دە مە گەلەکی رۆنی دکن، چەند ماتەرییالێن فۆلکلۆریک پێشکێشی مە دکن.

دەما مرۆڤ دخوازە بگهێژە سەرفرازیکێ و ببە خودانێ جەسارەتەکی مەزن، جڤاتێ چەند مۆتیفێن ئالەگۆریک ژ رەوشا ژنێ و بەدەوییا ژنێ هلچاندییە، دایە بەرچاڤان. ئەڤ گۆتنێن پێشییا ژی نیشان ددن وەکی جڤاتێ روومەتەکە چاوا بەدەو دایە ژنیان، چما ژن وەک پیڤان ژ خوە رە هلبژارتییە.

. ب خوازییا، دەست ناگهێژە باڤێ کەزییان.

. دلێ ترسۆنەک سینگێ گەور نابینە.

دەما مرۆڤ هەموو ڤان گۆتنێن پەسندار یێن کو دەربارەیی ژنان دە



هاتینە گۆتن ئان ژی رەوشا ژنان دانە بەرچاڤ، ژ خوە رە خستنە کۆک، لێ بەلێ بابەتێن مایین تینن زمێن، بەرەڤ دکە، مرۆڤ دبینە کو، ژنان دناڤ فۆلکلۆرا کوردی دە ژ خوە رە تەختەک ئاڤاکرنە، ب سەربلندی دژین و تمێ دلشانە، رووبکەنن.

## ژن وەک ئاڤاکارا مالێ

چاوا تێ زانین جڤاتەک، وەک کۆمێن پچووک ژ گەلەک مالباتان پێک تێ. دەما مرۆڤ هەموو ڤان مالباتان بەرەڤ دکە و دگهینە هەڤ، وێ چاخێ جڤاتەک ساز دبە. گەلۆ ژ بۆ سەلامەت و پێشەرۆژا هەر مالباتەکێ، ئەرک (وازیفە) و بەرپرسیارییا مەزن کی هلددە ل سەرملێن خوە؟ بەرسیڤان ڤێ پرسێ، مرۆڤ ب ئالیکارییا گۆتنەکە پێشییا ڤە دکارە بدە: ئاڤایا مالێ دەستێ ژنانە. ئەڤ گۆتنا هەم ئەرکەکێ، هەم ژی بەرپرسیاریکێ دسپێرە ژنان. ژن هەم ژ بۆ پاراستنا زارۆکان، هەم ژ بۆ برێڤابرنا کارێن هوندرێ مالێ، وەک پاقژی، ئامادەکرنا خوارنێ و هەم ژی د ئەفراندنا بەرهەم و مەحسوولەکی دە تمێ ئاکتیفە. گۆتنەکە مایین دیسا دبێژە: ئاڤاهییا مالێ کەبانی یە. گۆتنەکە نێزیکی ڤێ گۆتنێ ژی ئاوایە: ژن دکە مالاڤایی. دەما مرۆڤ ڤان گۆتنێن پێشییا باش، هوور و کوور ئانالیز دکە، ب هێسانی دبینە کو ژن نە تەنێ ئاڤاکارێ مالێ یە، وسان ژی ئیدارا مالێ دکە، مالێ دپارێزە: ژن گۆلە، مێر چەمە. گۆتنەکە نێزیکی ڤێ گۆتنێ ژی ئاوایە: مێرکانی بە ژن لیچە، ئانگۆ ژن بەرەڤ دکە، دەپۆ دکە و وەک بانکەکێ، رۆلەکە نیڤ - ئابۆری ژی دلیزە. پەیڤا لیچ بۆنا گۆلێن پچووک و بەرەڤبوونا ئاڤێ تێ ب کارئانین. ئەڤ هەردو گۆتن ژی

بەرپرسیياریکە مەزن دسپێرنە ژنان، کەبانییا مالێ دبە شێناهییا مالێ:
مال تێرە، کەبانی شێرە.
روومەتا کو جڤاتا کورد ئەوقاس دایە ژنان، نەدایە تشتەکی مایین.
جڤاتێ ژن وەک نیشانا نامووسێ یا هەرە مەزن حەسباندییە، پەیڤا ژن
گەلەک جاران جیهێ نامووسێ دە تێ بکار ئانین، پەیڤێن نامووس و ژن
کەتنە زکێ هەڤ، وەک گۆتنەکە پێشییا دبێژە: مێرێ کورمانج بۆی
نامووسێ کەڤچی ئاڤ دە دخەنقە. دیسا گۆتنەکە مایین گرنگییا نامووسێ
تینە زمێن: نامووس و خیرەت نە ب پەرانە. مێر تمێ نامووسا ژنێن خوە ل
سەر هەر تشتی رە دگرن، ژ بۆ نامووسا خوە. دکارن جانێ خوە ژی بدەن.
ژن و نامووسا وێ پرسەکە هەبوون – تونەبوونا مێرانە، گۆتنەکە پێشییا
ڤێ یەکێ گەلەک ڤەکری ئەشکەرە دکە: نامووسا ژنێ، چەکا مێرە.
نامووسا ژنێ دبە نامووسا مێران ژی: نامووسا مێر ژن خوەیی دکە.

## جیهێ داییکان تژی نابە

دێ (داییک) د فۆلکلۆرا کوردی دە حورمەتەکە مەزن دبینن. د وارێ
مەزنکرنا زارۆکان دە کەدا داییکان مەزنە، ئەڤ یەکا ژ بەر چاڤێن جڤاتێ
نەرەڤییە. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی جڤاتێ د ناڤ هەموو کاتەگۆرییێن ژنان دە
گرامی و حورمەتەکە بێهەمپا ژ بۆ داییکان نیشان دایە، وەک گۆتنەکە
پێشییان دبێژە: داییک هاتە دەردا خوەدێ رابوو بەردا. دەما جڤاتێ
داییک و باڤ رووبەری هەڤ کرنە، دانە پێشبەری هەڤ، جڤاتێ ل ئالییێ
داییکان جیە گرتییە: دێ ژ باڤ شرینترە. چما گەلۆ ئەڤ باوەری ب
سالان وەک گۆتنەکە پێشییان ل سەر زار – زمانێ مرۆڤان گەرییایە؟ ب



چەند گۆتنێن مایین ڤە، جڤاتێ بەرسیڤا ڤێ پرسێ ژی دایە.
. دێ هەژاندییە، دێ مێژاندییە.
. زارۆک ل سەر ملێ دێ مەزن دبن.
. زارۆک یا دێ یە نەیا باڤێ یە.
د وارێ مەزنکرنا زارۆکان دە کەدا داییکان زێدەیە، ئەڤ پەیڤێن زێرین
ژ بۆ داییکان هاتنە گۆتن. ژ ئالیکی دە هەر چقاس هەر ژن داییک نین بە
ژی، ئەڤ پەیڤان ب تەڤایی ژ بۆ ژنان هاتنە گۆتن. چاوا ئەم دبینن ئەو
روومەتا کو جڤاتێ دایە داییکان، ئەوقاس نەدایە باڤان، جڤاتێ ئانگۆری
کەدا مرۆڤان عەدالەت بەلاڤ کرییە: باڤ دمرە زار نزانن باڤێ وان مرییە،
دێ دمرە ستوویێ وان خار دبە. ژ بۆ بێسنۆرییا خرابییا مێرەکی نیشان
بدن، گۆگتنەکە پێشییا ئاوا دبێژە: مێرکێ خراب، چچکێ دییا خوە
گەزتییە. هەرچقاس گۆتنەکە پێشییا نین بە ژی، دەما ئیمکانەکە مەزن
دکەڤە دەستێ یەکی، ژ خوە رە ستارەکە گەرمین دبینە، ئیفادەکە کوردی
دبێژە: فلان کەس کەتە زکێ دییا خوە. ژ ئالییێ دن، گەلەک مرۆڤ وەک
کەڤنەشۆپیکێ، عەرف – عەدەتەکی ناخوازن نفرێن دییا وان ل سەر وان
بن، دەما داییکان شیرێ خوە ل زارۆکەکی خوە حەرام کر (وەک شیرێ من
تە حەرام بە!)، ئێدی ئەو نەفەر دکەڤنە بن بارەکی گران یێ روحی. دەما
کارێ وی د ژیینا رۆژانە دە ب هەڤ نەهات، ئەو سەرنەکەڤە، ئەو ڤێ
جارێ ڤان نفرێن دییا خوە تینە بیرا خوە. جڤات ب خوە ژی ڤان نفرێن
داییکان داڤێژە جیهەکی گوهێ خوە، د پێشەرۆژێ دە کۆنترۆل دکە، نە
حەقییا ل دژی داییکان ناپەژرینە، ب کورتی ئانگۆری ماتەرییالێن
فۆلکلۆریک جیهێ داییکان زوو– زوو نایێ تژی کرن.
د فۆلکلۆرا کوردی دە مۆتیڤا ژنانا دامارییان وەک مۆتیڤەکە بنگەهین

تێ حەسبین. دەما ژنا یەکی دمرە، ئەو زارۆکێن کو بێ دێ دمینن، دکەڤنە بەردەستێ دامارییان، لێ بەلێ داماری تو وەخت جیهێ داییکان نکارن تژی بکن. د ڤێ بابەتێ دە داییک و داماری وەک دو هێزێن ل دژی هەڤن. گۆتنەکە پێشییا جیهێ داییکان گەلەک باش نیشان ددە: وەختا دێ دمرە، دەستێ وێ ژێکن، پێ ئەتیما بکوتن. ئەڤ گۆتنا دخوازە بێژە کو زارۆکێن ئێتیم دمینن، برا نەکەڤن بەردەستێ دامارییان.

## وەکهەڤییا ژن و مێران

ب کێمانی گۆتنێن پێشییا و فۆلکلۆرا کوردی تو جوداتیەک وەک مرۆڤ نەخستییە ناڤبەرا ژن و مێران، هەردو جنس ژی وەک مرۆڤ حەسباندییە. ژن، د فۆلکلۆرا کوردی دە تو وەخت پچووک نەهاتنە دیتن، روومەتا وان نمز نەبوویە، هەر چقاس د ژیانا رۆژانە دە ژن جارجار پچووک تێن دیتن، تێن زێراندن، پێپەس کرن، هنجراندن و ژ ئالییێ مێران دە زۆر دەستیکە مەزن دبینن ژی، د ژییانا فۆلکلۆیک دە ئەم نکارن راستی دنیاکە وسان تاری و ڤان عەزیبەتان بێن، خەلەتی نە خەلەتییا فۆلکلۆرێ یە، ئەڤ رەوشا خراب ب گەلەک فاکتۆرێن مایین ڤە گرێدایی یە. زۆردەستییا ل ژنان دبە، گۆتنەکە پێشییا گەلەک ڤەکری ئەشکەرە دکە، لێ بەلێ رووڕەش دکە: ژن دارا شکەستییە. ئەڤ گۆتنا پێشییا، ل سەر هیمێن باوەرییا پاکی - ناپاکی، رندی - نەرندیێ ئاڤا دبە، نەپاکی و نەرندییێ پرۆتەستۆ دکە. د مالێ دە کەسا هەرە خەباتکار بێگومان کەبانی یە. جڤاتێ دیتیە کو، دیسا ژی ئەو ژ گەلەک تشتان بێپارە و ئەڤ یەکا وەک نەحەقیکە مەزن دیتییە، رەخنە کرییە:



. کەبانی تمێ بێپارە.
. کەبانی یا مەلوونە، یا مەحروومە.
. ژن دارا شکەستی یە.

ئەڤ گۆتنێن پێشییا ژی نیشانی مە ددن کو، جڤاتێ زۆردەستی و نەحەقییا ل ژنان دبە، تمێ ئانییە زمێن و ئەڤ نەوەکهەڤییا ل بەر چاڤێن جڤاتێ نەرەڤییە، دەست دایە ل سەر ڤێ رەوشا خراب. دەما ئەم چەند گۆتنێن پێشییا بەرچاڤ دکن، ئەم دبینن کو جڤاتێ تمێ وەکهەڤییا ژن - مێران ل سەر هەر تشتی رە گرتییە و قەت نەبە ئەڤ وەکهەڤییا ب گۆتن بە ژی، هێڤی کرییە:

. دێ تەڤ باڤێ جۆتە باسکە.
. شێر شێرە، چ ژن چ مێرە.
. ژن دیوارێ هوندرە، مێر دیوارێ دەرڤایە.
. ژن، مێر تاکی نە.

گۆتنا شێر، شێرە، چ ژنە چ مێرە، چاوا ئەم د گەلەک چاڤکانییان دە راستی وێ تێن، ئێدی بوویە نیشانا وەکهەڤییا ژن و مێران، دەما گلی تێ سەر ژنان، بێگومان جارا پێشین ئەڤ گۆتنا تێ بیرا مرۆڤان، د ناڤ کوردان دە گەلەک بەلاڤ بوویە. گۆتنەکە هەرە پۆپولەرە. ئەڤ پەیڤێن زێرین، باوەری و دیتنێن جڤاتێ یێن ل سەر رەوشا ژنان گەلەک ب ڤەکری دیار دکن. هەموو ئەڤ گۆتنان نایێ وێ مانێ کو ب رووچک و کارەکتەرێن خوە ڤە ژن و مێر یەکن. جڤاتێ ئەڤ جوداتییا ژن - مێران ژی تەسپیت کرییە و چەند سینۆر ژی کشاندنە: ژن ژن گۆتی، مێر مێر گۆتی. د زمانێ کوردی دە پەیڤا سەر ژنک، هنەکی ژی نەزەلالییا ڤان سینۆران نیشان ددە، ئەڤ پەیڤا ژ بۆ مێرێ کو زێدە سەرێ خوە دخە کارێ ژنان تێ

بکار ئانین. ژ ئالییێ دن، جڤاتێ وەکهەڤییا ژن – مێران ب زمانەکی دن، ئاوا نیشان دایە:

. ژن هەیە ژ مێران زێدەیە.
. کولفەت هەیە ژ سەد مێری زێدەیە.
. ژنا باش ژ هەزار مێرێ خراب چێترە.
. ژ کورێ بێخیرەت، قیزەکە کۆر پاکترە.
. قیز هەنە حەفت کورا نادن.
. قیزا فلانکەسێ خوونا مێرەکی یە.

د هەڤبێژەکە کوردی دە، دەما گلی تێ سەرێ ژن ئان ژی کەچەک ژێهاتی و مێرخاس، ئاوا تێ گۆتن: جابا حەفت مێرا ددە، ژنێن ئاوا د ناڤ کوردان دە کەچا باڤ تێن ب ناڤ کرن. ب خوە ژن بە، لێ بەلێ ب مێرا چووبە، ژ وان رە ژی مێرەژن دبێژن. گەلەک گۆتنێن پێشییا ب ئەشکەرە نیشان ددن کو تو وەخت مێر ژ ژنان هێزاتر نینن، نە هێزتر و نە ژی ژیرترن. هەردو جنس ژی مرۆڤن و وەک هەڤن، هەر جنس ژی ئانگۆری کەدا خوە، هێز و قابلییەتا تەڤی ئاڤاکرنا مالبات و جڤاتا خوە دبن. ژ ئالییێ دن، جڤاتێ ئەڤ یەکا ژی نیشان دایە، وەکی هەم د ناڤ ژنان دە، هەم ژی د ناڤ مێران دە کەسێن نە باش هەنە، کەسێن خراب هەنە، هەموو وەک هەڤ نینن.

دەما مێرەک دکەڤە تەنگاسییێ، بێگاڤ و نەچار دمینە، جارا پێشین ژن تێ هەوارییا وی و مێر خوە داڤێژە ل بەر بەختێ وێ: ژن کەلا مێرایە. دەما خوون درژە، مرۆڤ ژ هەڤ تێن کوشتن و دژمناتییێن مەزن ناڤبەرا مالبات، عەشیر و عێلێن کوردی دە پێشتاتێن، رۆلا ژنان مەزن دبە، ژ بۆ سەکناندنا شەر، ئەو وەک هێزێن ئاشیتیخواز، چارەسەرکار خوە بەرپرسیار دحەسبینن، پێشییێ ل ڤان شەرێن نەهەق دگرن، خرابییێ ناخوازن:



. کولفەت دچە خوونێ، خوون سافی دبە.
. مێرا خوە ئاڤێتن کەوارێ، ژن شاندن هەوارێ.

هەموو ئەڤ گۆتنان نیشان ددن کو چ ژن، چ مێر، هەردو ژی جانن، مرۆڤن، هەردو ژی د تانگا (ئالی) خوە دە، دەما ئیمکان و مەجال تێکەڤە دێت، دکارن بگهێژنە سەرفرازی و سەرکەفتنێن مەزن، د ئاڤاکرنا جڤاتەکێ دە ئانگۆری هێزا خوە بەشدار و جیە دگرن. دەما وان دەست دا دەست، پشت دان پشتا هەڤ هەتا مرنێ ژی، تو هێز ب وان نکارە: ژن – مێر تەڤر و بێر. د ناڤ خەتێن ڤێ گۆتنا پێشییا دە ژی، مرۆڤ دیسا راستی رێچ – شۆپا وەکهەڤییا ژن – مێران تێ.

## مۆتیڤا ژنا باش و ژنا خراب

جڤاتێ هەرچقاس جیهەکی ب روومەت دایە ژنان ژی، د ناڤبەرا ژنا باش و نەباش دە سینۆرەک ژی دانییە. ب ڤی تەحری هەرتم ژنا باش رووسپی کرییە، ژنا نەباش ژی روو رەش کرییە. جڤاتێ هەموو ژن نەخستنە تاکی تەرازیێ، ژ ڤێ خەلەتی و شاشییێ خوە پاراستییە، دوور مایە. ئەڤ هەردو گۆتنێن پێشییا دەربارەیی ڤێ یەکێ دە مە گەلەکی رۆنی دکن:

. ژن ژی هەیە، ژنکۆک ژی هەیە.
. ژن سەر ژنێ رە هەیە.

بەری کو جڤات بالا مرۆڤان بکشینە ل سەر ژنێن نەباش، زێتر رەوشا ژنا باش راخستییە بەرچاڤان و مۆتیڤا ژنا باش ئەفراندییە، ب ڤی تەحری

جڤاتێ خوەستییە، بنگەهـ و هیمێن هەر مالباتەکێ خوەش بێت ئاڤێتن، سبێ – دوسبێ، د پێشەرۆژێ دە ژ جیهێ خوە نەلڤن، نەلقن. چەند گۆتنێن پێشییا ب تایبەتی ل سەر ژنێن باش هاتنە ئەفراندن:

. ژنا باش بێمەنە برێ مێرێ خوەیە.
. ژنا باش نامووسا مێرێ خوەیە.
. ژنا باش دوورڤا کڤشە.
. ژنا باش سەبرە.

جڤاتێ تمێ باوەرییا خوە ب ژنا چێ و باش ئانییە، جەسارەت دایە وان، شاخسییەتا وان خورت کرییە و پێشتا برییە:

. برا ژنا چێ بە، برا ناڤ ئۆردییا عەسکەر بە.
. کەچا ب ئەسل ل ناڤ تابوورا لەشکەرێ رومی دە بە ژی، کەس پێ نکارە.

گەلەک گۆتنێن مایین ژی هەنە کو، جوداتییا ژنێن باش و ژنێن نەباش ئەشکەرە دکن، ل سەر ژنێن نەباش، خراب رەخنان دبارینن:

. ئاخرییا درانێ دێشە کشاندنە، ژنا خراب بەردانە.
. ژن هەیە گولا مێرێ خوەیە، ژن هەیە کولا مێرێ خوەیە.
. ژن هەیە برایە، ژن هەیە برا برە.
. ژن ژی هەنە، ژان ژی هەنە، مەرحەما دلان ژی هەنە.
. ژنا چێ مەرڤا دکە وەزیر، ژنا خراب مەرڤان دکە رەزیل.
. کولفەتا خراب مێران سەر بەرژێر دکە.
. ژنا خراب بیناموسییا کۆمێ یە.

د جڤاتا کوردی دە، هەر وسان ژی د گۆتنێن پێشسییا دە کۆمەک ژن،



ژنێ هەرە خرابتر هاتنە حەسبین، ب تایبەتی ژنێن خەبەر گەرۆک، ڤرڤری، دکن بلەبل، زێدە خەبەر ددن، کوود کودۆ و پیرهەڤۆک د فۆلکلۆرا کوردی دە تمێ دناڤ کاتەگۆرییا «ژنێن خراب» دە دگرن. جار جار دەما ئەم راستی چەند مۆتیڤێن کو ژنا سەربەرژێر دکن، رووماتا وان وندا دکن تێن ژی، ئەڤ گۆتنان نە هەموو ژنان، تەنێ ژ بۆ ژنێن خراب هاتنە ب کار ئانین. ژ بەر کو دەما ئەم ناڤەرۆکا چیرۆکا پەیدابوونا ڤان گۆتنان راچاڤ دکن، ئەم دبینن کو جارا پێشین ژنەکە خراب بوویە باعیسێ پەیدابوونا ڤان گۆتنان، نە ژن ب گشتی. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی ئەلەمەنت و مۆتیفێن ل سەر ژنان تمێ پۆزیتیفن، هەرچڤاس چەند مۆتیفێن نێگاتیف هەبن ژی، ئەڤ یەکا ژی مەرجێن پچووک دیتنا ژنان یێن دیرۆکی ڤە گرێدایی یە، ب تایبەتی یێن ئۆلی و پەدەرشاهی ...

## سالێجن کەچانییێ

د ژییانا هەر ژنەکێ دە سالێن کەچانییێ (کەچتی) جیهەکی ب تایبەتی دگرن، پشتی گەلەک سالان دیسا دەم – دەم تێن بیرئانینێ: پیری – کالی رۆژا رەشە، قیزتی – خۆرتی گولا گەشە. د هەر مالباتەکێ دە هەبوونا کەچان وەک خەمل، نەخش، شێناهی و دەولەمەندیکێ هاتییە حەسبین. جڤاتێ کەچ ژ هەموو خرابیێ پاراستی یە، نەخواستییە ناڤێ وان خراب دەرکەڤە، د ناڤ جڤاتێ دە سۆسرەت و رەزیل بن. کەچ هەنە، د جڤاتێ دە بوونە خوەیێ رووتەکە مەزن: قیزا فلانکەسێ خوونا مێرەکی یە. ئەڤ گوهدارییا کو جڤاتێ ل سەر کەچان پێک ئانییە، بێسەدەم نینە. ژ بەر کو کەچ ژ بۆ ئەتابەکە ژییانێ یا نووهـ خوە ئامادە دکن، پێویستە ئەو دناڤ

خوەشی و سەلامەتییێ دە مەزن بن، ناڤێن وان دەرنەکەڤە خرابییێ:

. برا مرۆڤ زیبیارەتا خراب بکە، ناڤێ قیزا خراب نەکە.

. برا قیزێ بن سەر خەنجەرێ، نەبن سەر خەبەرێ.

دەما کەچەک مەزن دبە، تێ سالێن مێرکرنێ، گەلۆ ئەڤ کەچا عازەپ و خاما نەسیبێ کێ یە؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ، چاوا ئەم د بینن د چەند گۆتنێن پێشییا دە گهیشتییە زەلالیکێ، گۆتنەک دبێژە: کەچ زیبیارەتە. چاوا تێ زانین هەژمارا کەسێن کو دچن سەر زیبیارەتان زێدەنە. د ناڤ ڤان کەسان دە، گەلەک دلکەتییێن کەچکێ هەنە، کەچ ژ ناڤ ڤان کەسان یەکی ژ خوە رە وەک مێر هلدبژێرە. جڤاتێ ب ئالیکارییا ڤێ تەسپیتێ خواستییە پێشییا مێرکرنێن بێدل راوەستە، ئالتەرناتیڤێن جودا جودا، ئیمکانێن تەزە پێشکێشی کەچان بکە، تۆلەرانسەکێ ژی پەیدا دکە. جڤاتێ خواستییە بێژە ب دارێ زۆرێ تو تشتەک ناچە سەری:

. کەچک وەک سێڤا دارێ یە، هەرکەس کەڤرێ خوە داڤێژێ، کی بخە وی رە یە.

. قیز هەیە دارا رەزە، هاتی – چوویی کەوتییێ خوە داڤێژی.

ژ ئالییێ دن ل سەر کەچان پێکئانینا زۆردەستییێ و د مالێ دە زێدە هیشتن و گرتنا کەچان ژ ئالییێ جڤاتێ دە باش نەهاتییە دیتن، ئەو وەک مێڤانێن عەزیز هاتنە ئەزماندن:

. قیز ئەولەدێ خەلقێ نە.

. قیز مێڤانێ مالێ نە.

. قیز زەبەشێ گیهشتی نە.



. کەچ هەوسار نابە.

ژییان ژ بۆ هەر کەچەکێ وەک خەونەکێ یە، خەو نە رۆژەکێ یە. ژ وانا گەلەک دلچڤیکن، د ناڤ گەلەکان دە خۆرتخاپینۆکی دبە عەدەتەکی، ب شەنگ – شەپالییا خوە تێن ناسین: دەنگێ قیزان زوو دچە کوڕان. ئەڤ رەوشا کەچان ژ بەر چاڤێ جڤاتێ نەرەڤییە: رۆ چوو دیزا، بوو فتارا قیزا. چاوا گەلەک زانە دبێژن، ب هاتنا باهارێ ڤە هیسێن ئەڤینێ، هەڤحەزکرنێ زێدە دبن. گۆتنەکە پێشییا باندوورا باهارێ ل سەر کەچان ب ڤی ئاوایی تینە زمێن: باهارە، قیزک چ هارە. پەیڤا هاربوونێ ، ل بال کەچان زێدەبوونا هیسێن سەکسوەل نیشان ددە.

ب کورتی ئەو قیمەتێ کو جڤاتێ دایە کەچان، تێ وێ مانێ کو دایە ژنان ژی. کەچ بوونە نیشان هەبوونا مرۆڤان و کۆمێ:

. بەدەو، گوند تین بەرچاڤ.

. باڤێ بێ قیز، چیبایێ بێ ئاڤە.

. قیزێ کێ هەنە، ئەو پادشایە.

. ژ ئالییێ دن جڤاتێ هەبوونا کەچ و کوڕان ئەوقاس زێدە مەزن نەکرییە، ب گشتی زارۆک وەک شرینایا مالێ دیتییە:

. قیز هەنە حەفت کوڕا نادن.

## شەرێ بووک و خاسییێ

دەما هەر کەچەک مێر دکە، ژ بۆ وێ ژیانەکە نوو ژی دەست پێ دکە. رۆژێن کەچانییێ ئێدی خەلاس دبن. بووکتی ژی وەک کەچانییێ د ژیانا هەر ژنەکێ دە دکارە ببە پەرییۆدەکە دلشا. ئەگەر د مالێ دە خاسی هەبە، هەژمارا زارۆکان ژی زێدە بە، ئێدی سالێن کەچانی و بووکتییێ دوور دکەڤن: قیزتی چقاییی خوەشە، بووکتی گولا گەشە – وەختا دکەڤە بەر دارێ دەرووشێ، پەرو باسکێ وێ دوەشە. د گۆتنەکە مایین دە بووک دیسا گلی، گازن و لۆما دکە: بوومە بووک. بوومە پەپووک.

د هەر مالباتەکە نوو پێکهاتی دە، د مالێ دە ل سەر پارەڤەکرنا ئیقتدارێ رێ و برێڤابرنا کارێن مالێ، گەلەک جاران د ناڤبەرا بووک و خاسییێ دە دژایەتی، نە رەحەتی و شەرێن مەزن دکارن دەست پێ بکن. گەلەک جاران دەما کەچەک مێر دکە، تێ مالێ، نەتەنێ راستی مێرێ خوە تێ، وسان ژی راستی دییا مێرێ خوە تێ و ئەڤ پیرەژنا دبە خاسییا وێ. ئانگۆری خاسییێ، ئەو رەوشا مالێ ژ بووکێ چێتر زانە و ژبەر کو دەمەکێ د ئاڤاکرنا مالێ و مەزکرنا زاڤێ دە کەدا وێ زێدە دەرباس بوویە، دخوازە هەرتم گۆتنێن وێ بێن جیە، ناخوازە ئەڤ بووکا نووە ل سەر وێ رە بە. ئەڤ رەوشا نووە گەلەک جاران دبە باعسێ پارچە بوونا مالباتان، سەدەمێن ل هەڤ نەکرنێن بووک – خاسییێ، بووک – زاڤێ و دێ – کور. ناڤێ بووکێ گەلەک جاران خراب دەردکەڤە: بووکا خەنقاندییە حەفت خاسی، ژ بلقینییا چێر ترسی. جارجار پێوەندییێن بووک – خاسییێ سەرراست دبن، د مالێ دە خوەشی و رەحەتیک پەیدادبە: بووکا چێ یە ،خاسی دێ یە. ژ بۆ کو هەرتم خوەشی و دلشاهی هەبە، دییا کور بەری زەواجێ چاڤێ خوە دگەرینە وەکی «بووکەکە باش» ژ «خوە» رە و کەچەکە



رند ژ کورێ خوە رە ببینە. ئەگەر کەچا براکی وێ هەبە، ڤێ یەکێ ژی بوونا پێشەرۆژا خوە، پشت گوهێ خوە رە ناڤێژە. چەند گۆتنێن پێشییا ڤێ یەکێ باش ئەشکەرە دکن:

. بووکا خالا دەلالییا مالا.

. بووکا ئاپێ کەتە کاپێ، بووکا خالێ دەلالییا مالێ.

ئێدی «کەسەکە خەریب»و «کەچێن خەلقێ» د مالێ دە تونن. پێوەندییێن بووک و خاسییێ ئانگۆری دێ – باڤێ کەچکێ، رەوشا مالباتا وێ، ژ هەڤ جودا دبن. چ دبە، برا ببە شەرێ بووک – خاسییێ ناقەدە، هەریەک تانگا خوە دە رۆیێ دبینە:

. بووک ئانی لەزە، دا گا و پەزە، سفکا مالێ دیسا ئەزە.

. بووکێ تونە زار – زمان، خاسییێ تونە دین – ئیمان.

. بووک هەیە تفاقا مالێ خوەیی دکە، بووک ژی هەیە خراب دکە.

دەمەکە وسان تێ ئێدی رەحەتییا بووکێ قەد نامینە، خوازییا خوە ل رۆژێن بهوری تینە، کەچانییا خوە دگەرە. فرسەند تێکەڤە دێست، ئیرۆ ژی دخوازە هەرە مالا باڤێ:

. بووک وسان مالا باڤێ حەز دکە، وەکی ئیزنێ بدی وێ پێخاس ژی هەرە.

. بەرێ بووکێ تێکەڤ مالا باڤێ وێ – وێ ب سەر سەرێ خوە ژی هەرە.

. مالا مێرێ ژنێ خەزنە بە ژی. دیسا چاڤێ وێ مالا باڤێ یە.

بێگومان ئەڤ داخوازییا ڤەگەرا مالێ، نەتەنێ ب دەردێ خاسییێ ڤە گرێدایە. گەلەک فاکتۆر و سەدەمێن مایین ژی ل سەر ڤێ ڤەگەرێ باندوورەکێ نیشان ددن، وەک بیرئانینا «رۆژێن کەچانییێ» ... ب کورتی شەرێ بووک و خاسییێ، وەک شەرێ هێوییان د فۆلکلۆرا کوردی دە جیهەکی فرە دکرە.

## نەچارییا ژنە بییان

دەما مێرێ ژنەکێ دمرە، ئەو ژنابی دمینە، ژێ رە دبێژن ژنەبی. ژ بۆ ژنەکێ وندا کرنا مێر، بوویەرەکە گەلەک ترش و تالە. چەند دژواری، سەرئێشی و تەنگاسییان پەیدا دکە. تەنێ ماین ئەوقاس نەهێسایە. ژ ئالییێ دن ژ نووە ڤە مێر کرن، زەواجەکە نووە ژی ئەوقاس نەهێسایە. ئەگەر مێر لە پەی خوە زارۆک ژی هیشتبن، وێ چاخێ رەوشا ژنەبییان هن ژی خراپتر دبە. تەنێ ماین ب سەری خوە ئێشەکە مەزنە، بالا هەر کەسی ل سەر ژنە بییان: ژنابی ناکەڤە تو مالا. ژنەبی ژ بەر شکبرنێ، ژ بەر ناڤێ وێ خراب دەرنەکەڤە و ژ بۆ سەلامەتا زارۆکان گەلەک جاران ناچە دەر-جیناران، مالا خوە دمینە: ژنابی زەف ژێ تێ خەبەردان. ئەڤ دۆرگرتنا جڤاکی، گەرینا گلی - خەبەران وەک تەلووکەکێ لنگێ ژنەبییان دکنە سۆلەکە تەنگ، نەچاری و بێگاڤی وان گەلەک دئێشینە، ژ شەرما نزانە چ بکە: ژنابی دەست بەر روویە. ژ ئالییێ دن، پشتی مرنا مێر، جڤات بەرپرسیارییا پاراستنا زارۆکان ژی دسپێرە ژنەبییان، ئەڤ یەکا ژی بۆنا وان بارەکی گرانە. رۆژێن کێف. خوەشی و عەشقێ ئێدی قەدییانە. ناخوازن ب دیتنا مێرەکی دن، ناڤێ وان ژی خراب دەرکەڤە، مەساژێن وەک «ژنا بێناموس خرابییا کۆمێیە» گوهێن وان قوول دکن. ب ڤی تەحری هەرتشت ل بەر چاڤێن وان رەش دبە، بینا وان گەلەک جاران تەنگ دبە. ب کورتی ژییان بۆنا ژنەبییان ب پرانی تاری و سار دبە، نزانن چ بکن: ژنابی مینا مەها ئاداریێ یە، گەه دگری، گەه دکەنە. ژبەر ڤان ئێشێن ژنەبییان، ئەو ناڤبەرا دوو ئاڤان دە دمینن، جارەکە دن مێر بکن ئان نا؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ، ئەوقاس نەهێسایە، ژ بەر ڤێ بێگاڤییێ ناڤێ ژنەبییان جارجار گەلەک خراب دەردکەڤە: ژنابی دو روویە.



دەما ژنەکە یەکی دمرە، ئەگەر زارۆکێن وێ مالباتێ ژی بن، رەوشا مێر ژی وەک ژنەبییان گەلەک خراب دبە. تژیکرنا جیهێ ژنا بەرێ ئەوقاس نەهێسایە، ب مرنا ژنێ، پەر - باسکێ ڤان مێرەبییان - ژنمربییان یەکتەن دشکێن د دەوشن: ژن دمرە، مێر سەربری دبە.

## پرۆتەستۆکە دژی پرژنییێ

دناڤ گۆتنێن پێشییا یێن کوردی دە بەشەکە گۆتنان ژی، چاوا تێ خویان ل دۆرا تەمایا پرژنییێ بەرەڤ دبن. ئەم ژ ڤێ یەکێ دەردخن کو، جڤاتێ ئەڤ تەحرێ زەواجێ گرنگی دیتییە و سەردا چوویە. ئانینا ژنەکە نووە، نە ژ ئالییێ زارۆکان دە، نە ژی ژ ئالییێ داییکێ دە هاتییە پەژراندن، ئەو ل دژی ئانینا ڤێ ژنا نووە دەرکەتنە. ئەڤ ژنا نووە ژ ئالییێ زارۆکان دە وەک ژنباڤ، ژ ئالییێ داییکێ دە وەک هێوی هاتییە ب ناڤکرن. هاتنا هێوییێ د پێوەندییێن ژن - مێر دە قەلیشتەکەکێ پەیدا دکە، د مالێ دە دبە سەدەمێن دلساریکە مەزن. جڤاتێ زێتر ئێریش برییە ل سەر باڤی، ئەو پرۆتەستۆ و روورەش کرییە، وەک گۆتنەکە پێشییا دبێژە: مێرێ دوو ژنا دوو روویە. د مالێ دە سەردەستییا کیژان ژنێ هەبە، بێگومان ستاتوویا ژنا دن دکەڤە، قەدرێ وێ نامینە. پێوەندییێن مێر ب کیژان ژنێ رە خورت بن، ب کیژان ژنێ ڤە کێفا وی زێدە تێ، ئەو ژنا دبە ژنا هەرە بەرچاڤ و سەردەست. ژنا کو روومەتا وێ زێدە نامینە، ب پرانی ژنا یەکەمینە، ووسان نین بوویا، مێر ژنا دوومین نەد ئانی (هەژمارا ژنا دکارە بگهێژە سێ سێ - چاران ژی). ژنا کو دبە گول و شرینا مالێ، زێتر ژنا بەدەو، جیوان و ژنا کو سالێ وێ هندکن. چ دبە برا ببە، ب تایبەتی ژنا یەکەمین، دەما ژنەکە ماین تێ سەر وێ، ژ ڤێ رەوشێ خرابتر، رەوشەکە دن نابینە: برا مەرەڤ هەرە سەر سێوییا، نەچە سەر هێوییا. جارجار هەردو ژن ژی، ژ رەوشا هێویتییێ

عاجزن. نەرازیبوونا هەردو ئالییان قەت نەبە ل سەر تەما پڕ ژنییێ دبە سەدەمێ هەڤرا پەیڤێن و دییالۆگێ. لێ بەلێ تەجروبێن چاوا نیشان ددن، ژنا یەکەمین هاتنا ژنا دووەمین وەک ئافاتەکێ دبینە: ژن دبێ برا بەختێ من هەبە، برا چاڤەکێ من توونەبە. ژنا پاشین ژ بۆ کو خوە تێخە چاڤێ مێرێ خوە، ژ دەستێ وێ چ تێ دکە، ب مێرێ خوە ڤە دزەلقە و ڤێ گۆتنا پێشییا ژ خوە رە دکە گوهار، دخە گوهێ خوە: ژن دکارە مێرا مینا دەستمالان ل سەر دەستێ خوە بگەڕینە. ئەو، ڤێ نێزیکاییێ ل دژی ژنا یەکەمین ب هۆستاتی و بزانەتی بکارتینە، جارجار مێر و ژنا پێشین بەری هەڤ ددە، رووما تا وێ هلددە بن پێیان، وێ پێپەس دکە. جڤاتێ ب چاڤەکێ باش هاتنا هێوییێ نەنهێرییە و ئەو پیرۆز نەکرییە: ژنا پاشین مینا پینە بەرۆڤاژی یە. ژنا پێشین ب هاتنا ژنا پاشین ڤە، گەلەک د ئێشە، بەر خوە دکەڤە، ئێدی دبە خولام و بەردەستیکە مالێ. ژ ئالییێ دن هەرچقاس، مێر چەند رۆژێن خوە ب کێف و عەشق دەرباس دکە ژی، د مالێ دە بێ پەرگالیکە مەزن دەست پێ دکە، رەوشا مالێ سەرۆنبۆ دبە: هەچی مرۆڤێ مالا خوە ب دەستێ خوە خراب بکە، برا دو ژنا بینە، گۆتنەکە مایین ژی ئاوا دبێژە: کابانی بوون سێ سێ، کۆدک ل بەر سێ.

وەکی ژانا هێوییا، ژانەکە مایین ژی ژانا ژنێ برانە. چاوا تێ زانین گەلەک مالباتێن کوردی، مالباتێن فرەهن، د مالێ دە چەند برا ب زاروزێچێن خوە ڤە دکارن بژین. لێ بەلێ جار جار دوبەندی و نەرەحەتیێن ناڤبەرا ژنێن وان هەر دچن مەزن دبن، ل سەر پارەڤەکرنا کارێن مالێ ب هەڤ ناکن، دبن دژمنێ هەڤ. چەند گۆتنێن پێشییا ل سەر ژنێن برانە، ل سەر ژنتییانن:

. ژنێ برا مەرەڤا دکن شیڤا گورا.

. ژنا برا نۆلا گورا.

. ژنتییا هەڤ را کرە بلەبل، برا هەڤ را بوونە دەرد وکول.



## ژن و نامووس

جڤاتێ سینۆرێن نامووسێ و بێناموسییێ گەلۆ ئانگۆری کیژان بنگەهان کشاندییە؟ دەما مرۆڤ دەربارەی ڤێ یەکێ دە چەند باوەری، ئاگاهداری و زانیارییان ژ ناڤ گۆتنێن پێشییا هلدچینە، ل سەر کوور دفکرە، مرۆڤ دبینە کو هەم ژن، هەم ژی مێر پشتی زەواج – مێرکرنێ پێویستێ، هن «کنجێن نووە» ل خوە بکن، گاڤێن خوە ب پیڤان پاڤێژن، ل پەی ژن – مێرێن مایین نەگەرن و چاڤێن وان نە ل دەر بە: هەر کەزی سۆرەک، سمبێل سۆرەک ل بەر هەیە. شاخەکە مایین یا ڤێ گۆتنێ ژی ئاوایە: هەرکەزی زەرەک سمبێل سۆرەک ل هەمبەرە. دەما دو کەسان بڕیار گرتن وەکی بزەوجن، پێویستە ل سەر بڕیارێ خوە ب سەکنن، دناڤبەرا وان دە پەیمانەک هاتییە گرێدانێ: ژن و مێر نە فینۆیێ سۆرن، هەر رۆ سەرێ یەکی بن، چ ژن ، چ مێر بە، هەردو ژی ئانگۆری ڤێ پەیمانێ نکارن وەک رۆژێن کەچانی – خۆرتانییێ پەی یارێن تەزە بن، پەی دلکەتییێن نووە بن. دەما ژن – مێر ژ هەڤرە حەلالبن، وێ چاخێ دوبەندی و سەر ئێشێن مەزن دکارن دەرکەڤن روویێ ئاڤێ، ئەڤ سەرئێشییان هەتا مرن – کوشتنێ ژی دچن. د رەوشەکە ئاوا دە دیسا ئەم تێن ل سەر مۆتیڤا «ژنا خراب» و «مێرێ خراب». ژ بۆ چارەسەرکرنا ڤێ ئێشا کو نایێ کشاندن، جڤاتێ دەریک ڤەکری هێشتییە: هەڤبەردان (تەلاق). گۆتنەکە پێشییا ب ڤەکری بۆنا ژن – مێرێن کو هەررۆ دکەڤنە قرکا هەڤ، ژ وان رە رییا خەلاسییێ نیشان ددە: بەردانا ژنێ عەدەتێ دنێ. مرۆڤ نکارە بێژە تمێ ژن دبن سەدەمێن مالخرابی و هەڤبەردانێ، جڤاتێ وسا ژی کێماسییێن «مێرێ خراب» ژی نیشان دایە، گۆتنەکە پێشییا دەربارەی ڤێ یەکێ دە چارچاڤەکێ پێشکێشی مە دکە، ب کێمانی ژنێ رووسپی دەردخە: چقاس ژنە رندبە، دیسا مێری تۆلە. چاوا تێ

خویان نەتەنێ ژن، دە مال مالێ دە نەرەحەتێ پەیدابوون، مێر ژی دبن سەدەمێن هەڤنەکرنێ د چارچاڤا بێ ناموسییا «ژنا خراب» گەلەک گۆتنێن پێشییا هەنە:

. کولفەتا بێ ئەسل پێشا خوە داڤێ ل سەر سەرێ خوە،

. دێلک نە ب بابە، کووچک نارە جەم،

. ژنێ دل کر دیوار قوول کر.

تشتەکێ بالکێش ژی ئەوە، د ناڤ گەلەک بێژەبەندێن «تەعبیر» کوردی دە، ژنێن خراب ئالییێ ناموسێ دە ب تەحرەکێ گەلەک تووژ هاتنە رەخنەکرن، جوداتییا وان و حەیانان تونەیە، ئەو وەک دێلک، کەلب، چێلەکان هاتنە ب ناڤکرن. ژبەر کو ل بال حەیانان پیڤانێن ئەدەب و ئەخلاق ژ ئۆرتێ رابوونە، ژنێن خراب ژی وەک وان حەیانان هاتنە دیتن:

. چێلەکا ناڤا بۆخا.

. چێلەکا چل بۆخە.

. کەلبا حەرام.

. دێلکا ناڤا گوند.

. دێلکا دۆخێ.

. بوویە دێلا سەر جەورا.

دیسا چەند بێژەبەند ژ ئالییێ ناموسێ دە ژنان روورەش دکن، رەخنان ل وان دبارینن، وەک:

. داوا خوە ئاڤێتنە سەر سەرێ خوە.

. دەلنگا خوە هەرماندن.

گەلۆ ڤان ژنێن کو ژ ئالییێ جڤاتێ دە هاتنە گونەکارکرن، ناڤێ ژنان ب گشتی چقاس خراب دەرخستنە؟ گەلۆ هەموو ژن وەک ڤان ژنێن خراب هاتنە دیتنێ؟ گەلۆ تەڤلهەڤیکە ئاوا، یەککرنەکە ئاوا، ل سەر پێکئانینا



سورەتەکی ژنا خراب د ناڤ جڤاتێ دە باندوورەکە چاوا هیشتییە؟ بەرسیڤێن ڤان پرسان دکارن جیهێ ژنان گەلەکی زەلالتر و باشتر بدن خویا کرن.

ژ ئالییێ دن جارجار مێر بێ سەبەب، ب ژنێ رە شەڕ دکە، گەلەک تشتان بەرخوە دەردخە و دکارە ئیفترایێن مەزن ژی باڤێژە ژنێ: ل ژنا خوە مەنییان بوو، دگۆت گاڤا تو هەڤیر دکی قوونا خوە دهەژینی. کومرەشی، دەخەسی، چاڤنەباری و حەسوودی د ناڤا جۆتێن وسان دە گەلەک فرەیە، بەهەجۆکی جانێ هەردو ئالییان ژی دخوە و تمێ هەردو ئالی ژی شکێ دبنە هەڤ: دلێ وی بالتووزا وی گرتییە، مەنییا ژنا خوە دگەرە.

جڤات د ناڤ گەلەک سالان دە هاتییە ل سەر وێ باوەرییێ کو ژ ئالیکی دە زەواج، ژ ئالیکی دە یارتی ب هەڤرە نامەشن، هەبوونا هەر پێوەندیکێ، تونەبوونا پێوەندییا دن ب خوە رە تینە، جڤاتێ گۆتنا خوە ئاوا کورت برییە:

. کی هێڤییا یارێ ما، بێژن ما.

. ژن، مێر نە فینۆیێ سۆرن، هەررۆ سەرێ یەکی بن.

چەند گۆتنێن پێشیا هەنە کو، ئەرک و بەرپرسیارییێ ژن – مێران یێن شەڤێ، یێن جنسی (سەکسوەل) ب ڤەکری تینن بیرا وان.

ژنا زوو رادزێ مێرێ خوە زوو کال دکە.

. زلام هەرتم دخوازە، لێ هەرتم نکارە، پیرەک هەرتم دکارە، لێ هەرتم ناخوازە.

## چاڤکانی

١– حەجییێ جندی، مەسەلۆک و خەبەرۆکێد جماعەتا کوردا ، ئەریڤان، ١٩٨٥ .
٢– ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، مەسەله و مەتەلۆکێن کوردی. وەشانێن رۆناهی، زوریخ، ١٩٧٦ .
– ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، مەسەله و مەتەلۆکێ جماعەتا کورد. جلت I- II، ئەریڤان، ١٩٦٩ – ١٩٧١ .
– ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، گۆتنێن پێشییان (ب رووسی)، مۆسکۆڤا، ١٩٧ .
٣– هووسەیین دەنیز، گۆتنێ پێشییێ کوردا، ئیستەنبۆل، ١٩٩١ .
٤– ئا. بالی، گۆتنێن پێشییان ئێن کوردی، ئیستەنبۆل، ١٩٩٣ .
٥– زەینەل عابدین زنار، خوەنچە، جلد I، ستۆکهۆلم، ١٩٨٧ . گۆتنێ پێشییا: رووپ ١ – ٣٠ .
٦– مەله مەحموود دێرشەوی، مشتاخا چییا – ژ گۆتنێن پێشییا، ستۆکهۆلم، ١٩٨٩ .
٧– م. و. خامۆیان، فەرهەنگا کوردی –رووسییە فرازیۆلۆگی، ئەریڤان، ١٩٧٩ .
٨– ژ بۆ کو خوەندەڤان وان گۆتنێن پێشییا یێن کو ل سەر بابەتا ژنان هاتنە گۆتن ب هێسانی ببینن، ل بەر دەستێن وان بن، ئەم پرانییا ڤان گۆتنێن پێشییا ئانگۆری رێزا ئالفابەتێ ل ژێر پێشکێشی خوەندەڤانان دکن: ئاڤایا مالا دەستێ ژنانە .. ئاڤایا مالێ کەڤانی یە.. ئاخرییا درانێ دێشە کشاندنە، ژنا خراب بەردانە.. باهارە، قیزک چ هارە .. باڤ دمرە، زار نزانن باڤێ وان مرییە.. دێ دمرە ستوویێ وان خار دبە.. بابێ گۆر کری، ژنا ڤرکری، ژ وانان تشتەک دەرنایێ.. باڤێ بێ قیز چییایێ بێ ئاڤە.. باڤێ پاک مەزەلێ وی بەر دەرێ قیزێ یە.. بەدەو گوند تینن ل بەر چاڤ.. بەرێ تەختەیا ژنان بوویە. بەردانا ژنێ عەدەتێ دنێ. بەختێ دێ جهێزێ قیزێیە. بەرێ بووکێ تێکەڤە مالا باڤێ وێ – وێ ب سەر سەرێ خوە ژی هەرە.. ب خازییا دەست ناگهێژە باڤێ کەزییان.. بلا ژن چێ بە، برا ناڤ ئۆردییا عەسکەر بە. بلا کەچ بە، برا پیر بە.. برا کورەک ببە، ناڤێ قێزا لێ داینن.. برا ل خێرا برێ بوونا، ژنا برێ مەهرە نە دکر.. برا مەرڤ هەرە سەر سێوییا نەچە سەر هێوییا.. برا مەرڤ زییارەتێ خراڤ بکە، ناڤێ قیزان خراڤ نەکە.. برا سەری هەبن، کوم گەلەکن.. برا قیزا بن سەر خەنجەرێ، نەبن سەر خەبەرێ.. بووک ب دلێ زاڤێ یە.. بووک هەیە.. کولا خاسییا خوەیە.. بووک هەیە تفاقا مالێ خوەی دکە – بووک ژی هەیە بەلا دکە.. بووک ل هەسپێ یە، کەس نزانە نەسیبی کێ یە.. بووک ل مە شەرم دکە، روو دگرە، زک ڤەدکە.. بووک ل هەسپێ یە، کەس نزانە نەسیبێ کێ یە.. بووک سییارێ هەسپێ یە، کەس نزانە قسمەتێ کێ یە.. بووک وسان مالا باڤێ خوە حەز دکە، وەکی ئیزنێ بدی وێ پێخاس ژی هەرە.. بووکا ئاپێ کەتە کاپێ، بووکا خالێ دەلالییا مالێ.. بووکا رەوشا مال. بووکا مالیێ رازا قیز ئانی، گۆتن گونەکاری یا خولامە.. بووکا مالێ شوغل دە خوە دخاپینە، خۆرتان رە کەفچی – کۆ دکاتینە.. بووکا چێ یە – خاسی دێ یە.. بووکەک ئانی لەزە، دا گاو پەزە، سڤکا مالێ دیسا ئەزە .. بووکێ توونە زار – زمان، خاسییێ تونە دین – ئیمان.. بووکێ خالا، دەلالییا مالا.. بووکێ خەنقاندییە حەفت خاسی، ژ بلقینییا جێر ترسێ.. بوومە بووک، بوومە پەپووک.. چاڤێ مەلله سەر بووکا جینارایە.. چڤا ژن رند بە، دیسا مێرێ تۆله .. داماری نابە دێ –داک.. داییک هاتە دەردا، خوەدێ رابوو بەردا.. دێ بوو، لێ بوو دێماری.. داییێ ببینە، دۆتێ بستینە.. دەنگێ قیزا زوو دچە مالا کورا.. دێ ببینە و قیزێ بحەبینە.. دێ بوو دێماری، باڤ بوو فلێ کاڤارێ.. دێ چی یە، دۆت ژی ئەوە .. دێ، دۆتێ شەرکر، کێمئاقلا باوەرکر.. دێ هەژاندییە، دێ هێژاندییە.. دێ ژ باڤێ شرینترە.. دێ و لاو شەرکر،

بێئاقلا باوەرکر.. دێ تەڤ باڤێ وەکە جۆتە باسکە، دێلک نە ب بابە، کووچک نارە جەم.. دلێ ترسۆنەک سینگێ گەورە نابینە.. ئەگەر ئەز ببم کەچ ئەز زانم ئەزێ دۆخینا خوە چەند جارا گرێ بدم .. ئەڤا دلە نە ساڤارە، پاریکی لێدخە دبوهرە. ئەو پیرەکە زەمانی یە، گەلەک گلی بن وێ دە هەنە.. ئەز دبێم: خادمم، ئەو دبێ: ژ لاوک و قیزەکان چ خەبەر.. گا بدە گامیریا، ژن بدە ژمریا.. گەرەکێ بووک ب دلێ زاڤێ بە.. گۆتن «ئاپۆ ژنا تە کەڤرە»، گۆت: «ژ منەتێ چێترە».. دلێ وی بالتووزێ گرتییە، مەنییا ژنا خوە دگەڕە .. دلێ دێ دۆتێ ژی هەڤ دمینە.. گولا سوورەتێ ژنان، مێرە.. هەر کەزی یسۆرەک، سمبێلسۆرەک ل بەر هەیە.. هەر کەزیزەرەک، سمبێلسۆرەک ل هەمبەرە.. هەتا دلێ دێ نەکەڤێ، قیزێ نادێ.. هەتا خانم خەملی، دەف و دەوات کەملی.. ژن بەدەوییا عەمرە. ژن چاڤ ل دەرە، مێر خالی ل سەرە.. ژن دارا شکەستی یە.. ژن دیوارێ هوندورە، مێر دیورایێ دەرڤایە.. ژن دبێ برا بەختێ من هەبە، برا چاڤەکی من تونەبە.. ژن دکارە ژنا رێ داگەرینە، مێر نکارە ژنا رێ دا گەرینە.. ژن دکارە مێرا مینا دەسمالا سەر دەستێ خوە بگەرینە.. ژن دکە مالئاڤاییی. ژن دمرە.. مێر سەربڕی دبە.. ژن دنێ دە تو تشت دزیڤا جەم خوە خوەیی ناکە، خەنژی دلکەتییێ خوە.. ژن گۆلە مێر چەمە.. ژن ئەوە، زارێ خوە خوەیی کە.. ژن هەنە، بەرانبەری سەد مێری نە.. ژن هەیە گولا مێرێ خوەیە، ژن هەیە کولا مێرێ خوەیە. ژن هەیە، ژ مێران زێدەیە.. ژن هەیە برایە، ژن هەیە برا برە.. ژن هەیە زەڤییا بەرگوندە.. ژن ژی هەنە، ژان ژی هەنە، مەرهەما دلا ژی هەنە.. ژن ژی هەیە، ژنکۆک ژی هەیە، ژن ژن گۆتی، مێر مێر گۆتی.. ژن کەلا مێرایە.. ژن کانییا ژییانێ یە.. ژن کەلایە، مێر گرتی.. ژن کو هەیە تۆلا مارێ نیڤکوشتی یە.. ژن کو حەز بکە دکارە کەڤر قوول بکە.. ژن مێر رووسپی دکە.. ژن مێر تاکی نە.. ژن مێرا ناترسە وەکی شەرما وێ تونەیە.. ژن سەر ژنێ رە هەیە، ژن ستوونا مالێ یە.. ژن شوورێ پشتا مێرێ خوەیە.. ژن و مێر، تەڤر و بێر.. ژنا باش بێمەنە.. برێ مێرێ خوەیە.. ژن تەنێ خوە شەرم دکە، کەسەکی شەرم



ناکە.. ژن و مێر نەفینۆیێ سۆرن هەرۆ سەرێ یەکی بن.. ژنا باش ژ هەزار مێرێن خراب چێترە.. ژنا باش سەبرە.. ژنا بەدەو بەلا سەرییانە.. ژنا بێخوەدی هار دبە، مێرێ بێخوەدی ژار دبە.. ژنا بێخوەدیی شەرم ناکە.. ژنا بێ زار دلێ وێ ناشەوتە مالێ.. ژنا بی ناکەڤە تو مالا.. ژنا بی زەف ژێ تێ خەبەردان.. ژنا بی مینا مەها ئادارێیە.. گەه دگری، گەه دکەنە. ژنا بی دەست بەر روویە.. ژنا چێ مێر رادکە.. ژنا چێ مەرڤا دکە وەزیر، ژنا خراب مەرڤا دکە رەزیل.. ژنا دو دۆتان، ددە خوە دو لۆتان، نە ل ڤر نە ژی ل جزیرا بۆتان. ژنا کێ باشە، مالا وان تمێ دەواتە.. ژنا کو دکودۆ نەکەڤە دەستێ دژمنێ من.. ژنا کۆتی مێرێ باش کۆتی دکە – ژنا باش مێرێ کۆتی باش دکە.. ژنا مێر بە، دبێ: دووری من هەرە هەسپێ من تەخە.. ژنا نە دەلال چاڤێ مرۆڤان دئێشینە، ژنا دەلال دلێ مرۆڤان دێژینە.. ژنا پاشین مینا پینێ بەرۆڤاژی یە.. ژنا خراب، نە تێ کوشتن، نە ژی تێ بەردان.. ژنا شەرمین ب مللەتەکی، مێرێ شەرمین ب کراسەکی.. ژنا قەنج سەیدە، یا خراب قەیدە.. ژنا تە کیدەرێ، تو ژی ژ وێ دەرێ.. ژنا خراب بێناموسییا کۆمێ یە.. ژنا خەلکێ راموسانەک، هەسپێ خەلقێ مەییدانەک.. ژنا وی ژنە، لۆما مالا وی رەنگینە.. ژنا زوو رادزێ، مێرێ خوە زوو کال دکە.. ژنێ برا مەرڤا دکن شیڤا گورا.. ژنێ برا نۆلا گورا.. ژنێ دل کر دیوار قوول کر.. ژنێ دکر مێرێ خوە سل کر.. ژنێ گۆ: برا ئەز ژنا مێرێ چێ بووما، برا ئەز رۆژەکێ روویێ دنێ بووما. ژنتییا هەڤرا کرە بلەبل، برا هەڤرا بوونە دەردوکول.. کەبانی تمێ بێ پارن.. کەبانی یا مەلوونە یان مەحرورمە.. کەچ هەفسار نابە. کەچا میران ب قەلەندێ گاڤانان نایێ.. کەچک وەک سێڤا دارێ یە، هەر کەس کەڤرا داڤێژێ، کی بێخە وی رەیە. کەچک زییارەتە.. کی هێڤییا یارێ مایە، بێ ژن مایە.. کولفەت دچە خون سافی دبە.. کولفەت شورێ دو دە ڤەل پشتا مێر.. کولفەت کو هەیە پارسوویێ خارە.. کولفەت نەینکا مالێیە.. کولفەت هەیە سەد مێری زێدەیە.. کولفەت هەیە جەه دکە گەنم، کولفەتا هەیە گەنم دکە جەه.. کولفەتا بێ ئەسل پێشا خوە داڤێ ل سەر سەرێ خوە..

کولفەتا بێ دورروویە.. کولفەتا چێ بە، مێر ژی پێ رە چێ دبە.. کولفەتا دەستدرێژ تمێ، روورەشە.. کور دارێ بڤێ هلتینە، قیز تەشییا دایێ هلتینە.. کولفەتا دزی کر، وێ بێ بەردانێ.. کولفەتا ئەسلێ وێ جی، تی بە ئان برچی، بکوژی جیکی دە ناچی.. کولفەتا خراب مێران سەربەرژێردکە.. کور ل باڤان دچن، قیز ل دییان دچن.. کورد ژ گشکا زەفتر ژنا خوە، هەسپا خوە و چەکا خوە حەز دکە.. ل ژنا خوە هێجەتێ دبێژیت: تو چما قوونا خوە ل بەر بێژنگێرا دهەژینی.. مال تێرە، کەبانی شێرە.. مالا بێ ژن مینا ئاشێ خرابەیە.. مالا مێرێ ژنێ وەکی خەزنەبە ژی، دیسا چاڤێ وێ مالا باڤێ یە.. مالا کو ژن نەخواشە، دەرێ خوە کلیتە.. مالێ دە تونە ئارڤانۆک، ناڤێ ژنێ دینانۆک.. مەمکێ قیزا زەینەتن، کەلاخێ پیرێ رۆبەتن.. مێرێ کورمانج گاڤا تێر خار یا مرۆڤان دکوژە، یا ژنەکێ درەڤینە.. مەریکی خرابە، ئەوی چچکێ دییا خوە گەستییە.. مەرڤ سەر خیرەت و ناموسا خوە دمرە.. مێر ژی هەموو نەیەکن، ژن ژی هەموو نەیەکن.. مێر – ژن هەڤرا رک، خراب دبە ئەو مالک.. مێرکانی بە، ژن لیچە. مێرا خوە ئاڤێتن کەوارا، ژن شاندن هەوارا.. مێرێ باش ژنا وی خورتە.. مێرێ دو ژنا دورروویە.. مێرێ کرمانج بۆی ناموسێ کەڤچی ئاڤ دە دخەنقە.. مێرێ دوژنک هێسیرە.. مێرک ل ژنا خوە مەنییان بوو، دگۆت گاڤا هەڤیر دکی قوونا خوە دهەژینی.. مەریکێ خراب، چچکێ دییا خوە گەزتییە.. مێرکرن ژی هەیە، مێر مرن ژی هەیە. ناموسا ژنێ چەکا مێرە.. ناموسا مێر ژن خوەیی دکە.. نە ژنا بەلاش، نە خولامێ بێ مەعاش، نە عەردێ کاش.. نە ژنا کەنۆکی، نە مێرێ شەرمۆکی.. پارسوویا ژنێ خارە، لۆما ئیعتیبارا وێ تونە، پیر ب گانەکی نابە قەحبک.. پیرێ باوەر نە دکر مێرکە، کو مێر کر دەوا حەفتەک و هەشتەکان کر.. قیز ئەولەدێ خەلقێ یە. قیز چرا خەلقێ یە.. قیز هەنە حەفت کورا نادن.. قیز کو هەیە – دارا رەزە، هاتی– چوویی کەوتییێ خوە داڤێژێ.. قیز مێڤانێ مالێ یە.. قیز زەبەشێ گیهشتییە.. قیزا بێقەلەن زمان درێژە. قیزا فلانکەسێ خوونا مێرەکی یە.. قیزەک نازاند –گوندەک بەزاند.. قیزێ کێ هەنە، ئەو پادشانە.. قیزێ دل کر، تاس ئاڤێت دیوار قوول کر.. قیزتی چقایی خوەشە، بووکتی گولا گەشە، وەختا دکەڤە بەر دارێ دەرگووشێ، پەڕ و باسکێ وێ دوەشە.. رەڤا ژنێ عەدەتێ دنێ.. رەوشا ژنان کۆفێ یە.. رەوشێ قیزا کەزینە.. رۆچوو دیزا، بوو فتارا قیزا.. شێر شێرە، چ ژن چ مێرە.. شەڕێ کووچکان ل سەر دێلانن.. شێورا ژنا بێرییا بزنا.. ئوسا ملاهیمە مینا قیزا کەزی.. خەو نەما ل پچووکا، فەدی نەما ل بووکان.. یەکی ژنا خوە بەردا بوو، دگۆت وەرێ ببە یارا من.. یێ ژنێ بەردە ل پانییێ نانێرە.. وەختێ دێ دمرە، دەستێ وێ ژێکن، پێ ئێتیما بکوتن.. زاریا دێ یە، نەیا باڤێ یە. زارۆک ژ باڤێ دە ئێتیم نامینن، ژ دێ دە ئێتیم دمینن.. زارۆ ل سەر ملێ دێ مەزن دبە. زلام هەرتم دخوازە، لێ هەر تم نکارە.. پیرەک هەرتم دکارە، لێ هەرتم ناخوازە.

## د دەستانێن کوردی دە بەرخوەدان و سەردەستیکە ژنان

### هەر دەستانەک ژیینەکە

د دەستانێن (بەیت، سەرپێهاتی) کوردی دە گەلەک رەئالیتە یێن ژیینێ هەنە ژیین، تنێ دکەلە و ژینداریا ڤان بەرهەمان مە گەلەکی رۆنی دکن، شەمال و تیرێژین بەرفرەه بەلاڤ دکن، ژ بۆ کو دنیا مە هین ژی خوەشکتر ببە، مە دن اڤ رۆناهیکە مەزن دە دهێلن، مەساژێن گەلەک خورت دگهینن مە، د رۆژێن تەنگ دە تێن هەوارییا مە مرۆڤان، ژ مە رە دکارن ببن رەفەراسێن پڕگرانبها. ژ بۆ رۆنیهیکرنا جیهێ ژنان د جڤاتا کوردی دە، ئەڤ دەستانان گەلەک رێنشاندارن، جۆرە جۆرە ماتەرییال و ئیمکانێن فۆلکلۆریک و ئەدەبی پێشکێشی مە دکن.

دەما مرۆڤ دەستانێن کوردی باش ئانالیز دکە و تێ دە کوور دبە، د

ناڤ ڤان دەستان، سەر پێهاتییێن ناڤ و دەنگ دە ئەم راستی سەردەستیکە ژنان تێن، ژن خوەدی ئەرک و بەرپرسیارن، هەڤسازی و پێشکەتنا بوویەرێن ناڤ دەستانان دە رۆلەکە مەزن دلیزن، ئەو تنێ ل دژی نەحەقی و بێداریێ رادوەستن، بەر خوە ددن. د ڤان دەستانان دە تەکۆشینەکە ژنان هەیە. ژنان ب خوینا خوە ڤە بە ژی، د دنیا ڤان دەستانان دە ژ خوە رە تەختەک ئاڤاکرنە ژ بۆ بجهئانینا داخوازی، هێڤی و خەونەرۆژێن خوە تمێ یا خوە کرنە، بێ دلی، دو دلی ئان ژی بێگاڤی د بڕیارێن وان دە کێم تێ دیتن، ئەو د ڤی واری دە گەلەک سەرهیشکن، گەلەک جاران ژ بۆ دلکەتییێ خوە دمرن، جانێ خوە ددن، وەک مەجنوون دین دبن، قەت نەبە د گورێ دە خوە دگهینن هەڤ، ژبەر ڤێ یەکێ ژی، د ڤان دەستانا دە ئەم راستی تراژەدییێن مەزن تێن. د دەستانێن کوردی دە رەنگ و تەحرێ بوویەرێن بنگەهین، چاوا ئەم دبینن ب دەستێ وان دگوهرن ئان ژی ئەو ب خوە دبن بایسێ بوویەرێن گرنگ. پێکائانینا ئاڤاهییا بوویەرێن دەستانێ دە و د وارێ زەلال بوونا مەسازا ڤان بەرهەمان دە، ئەم دکارن بێژن مێرخاسێن ژنین رۆلەکە بەربچاڤ دلیزن. هەموو شاخ و گوهارتنۆکێن ڤان دەستانان دە، ژن د رێکە راست، پۆزیتیڤ، قەنج و د رێکە کوسترۆکتڤ دە دمەشن. هەم ژ بۆ ئازادییا خوە (ئامانجپاتیۆن)، هەم بۆ ئازادییا وەلاتێ خوە، هەم ژی بۆنا مافێن مرۆڤی، چاوا ئەم دبینن ئەو خوە داڤێژن ناڤ ئاگرێن مەزن. دەما مرۆڤ هەموو ڤان دەستانان و شاخێن وان رووبەری هەڤ دکە، هەمبەری هەڤ دکە، مرۆڤ دبینە کو گەلەک بابەتێن هەڤپار، هەڤرەنگ د ناڤەرۆکا ڤان بەرهەمان دە هەنە. گەلەک جاران مێرخاسێن ژنین، مێرخاسێن مێرین دخن بن باندوور و کۆنترۆلا خوە، مێران ژ خرابییێ، ژ رۆژێن رەش دپارێزن، رێیێن راست نیشانی وان ددن.



هەتا نها رووبەریهەڤکرنا دەستانێن کوردی زێدە نەهاتنە پێکئانین. نەتەنێ رووبەریهەڤکرنا وان، ئەڤ بەرهەمان ئیرۆ چاوا ئەم دبینین هێ نەهاتنە بەرەڤ کرن، دەرباسی ل سەر کاغزی نەبوونە. ژ بەر ڤان دژوارییان، ئیمکان و مەجالا ل سەر ڤان بەرهەمان کارکرن، لێکۆلین چێکرن ژی بێگومان ژار و قەلس دکەڤە ئان ژی پێک نایێن. دەما مرۆڤ ڤان بەرهەمان رووبەری هەڤ دکە، مرۆڤ راستی زانیاری، ئاگاهداری و ئەنجامێن گەلەک گرانبها تێ. ژ بەر کو ئەڤ هەزاران سالە، ئەڤ بەرهەمان ل سەر زار – زمانێ گەل دگەرن، گەل ژی باوەری، گۆتن و جەرباندنێن خوە یێن ب سالان تەڤی ڤان بەرهەمان کرنە، ئەو دەولەمەند کرنە، تەحر و رەنگەکی نووه دانە وان، د داوییێ دە تەڤ بەرهەمان بوونە دەولەمەندیکە فۆلکلۆریک. د ڤێ لێکۆلینا خوە دە ئەم دخوازن قاسی ( ٢٠ ) دەستانێن کوردی سەرپێهاتییێن گەل یێن ناڤدار رووبەری هەڤ بکن و د ناڤەرۆکا ڤان بەرهەمان دە تەنێ جیهێ ژنان، سەردەستییا وان، رۆل و بەرپرسیارییا وان تەسپیت بکن و خوە بگهینین چەند نێرین – باوەرییێن هەڤپار و گشتی. مۆتیڤا ژنان، ئەڤین و زەواج – مێرانییێ د فۆلکلۆرا کوردی دە مۆتیڤەکە گەلەک خورت و فرەهە. لێ بەلێ د ڤێ لێکۆلینا خوە دە زێتر ئەم دخوازن ل سەر دەستان و سەرپێهاتییێن گەل، بەیتێن کوردی بسەکنن. بەرهەمێن کو ل سەر بابەتا ژنان ئاگاهداری و زانیارییێن بالکێش تێ دە هەنە، دناڤ فۆلکلۆرا کوردی گەلەکن، ماتەرییال هێژایی لێکۆلینێ نە، وەک میسال: مەمێ ئالان و زینا زێدان، سیابەند و خەجێ، کەڕ و کولک، بنەڤشا نارین و جەمبەلییێ هەکارێ، مەم و ئەیشێ، زەمبیل فرۆش، سێڤا حەجی، مەنشا عەلییێ سەلیم ئاغا، کەلا دمدمێ، فلیتێ قوتۆ، بشارێ چەتۆ، سالحۆ ... ژ دەر ڤان دەستانان چەند دەستانێن مایین

ژی، ب تایبەتی د ناڤ کوردێن ئیرانێ دە بەلاڤ بوونە، پاشێ هاتنە
بەرەڤ کرن، گەلەکی بالکێشن، وەک فەرخ و خاتون ئاستی، شۆر
مەحموود و مەرزنگان، مشهر و وەفا، بەهرام و گولاندام ...[1].
لێکۆلینڤانێ ئالمانی ئۆسکار مان، جارا پێشین ب فرەهی چەند دەستانێن
کوردی هەم بەرەڤ کرن، هەم ژی ئەو وەرگەراندن زمانێ ئالمانی، وەک دو
پرتووک چاپ کرن، وەک و خەزال، ناسر و مالمال، قەر و گولیزەر،،
دەستانێن هەتا نها نە بەرەڤکری وەشاندن[2].

بێگومان گەلەک دەستان و سەرپێهاتییێن گەل یێن مایین ژی هەنە کو
دکارن د ڤێ بابەتێ دە ئالیکارییا مە بکن و مە رۆنی بکن. ب تایبەتی
چەند دەستانێن کو د ناڤ گەلێن رۆهلاتێ دە بەلاڤ بوونە، وەک لەیلا و
مەجنوون[3]، یوسف و زەلیخە[4]، رۆستەمێ زال[5]، گەلەک دەستان
هاتنە کەتنە زمانێ کوردی ژ دەر شاخێن دەستانێن کوردی، چاوا ئەم دبینن
چەند شاخێن ڤان دەستانان یێن ئەدەبی ژی، پاشی ژ ئالییێ نڤیسکارێن
کورد دە هاتنە ئامادەکرن.

رووبەری هەڤکرنا شاخێن فۆلکلۆریک و ئەدەبی ژی ئانگۆری هەر
دەستانەکێ دەولەمەندی و رەنگینیکێ پێشکێشی مە دکە. ژ ئالییێ دن
چەند دەستانێن کو د زمانێ کوردی دە زێدە بەلاڤ نەبوونە، ژ ئالییێ
کوردان دە هاتنە وەرگەڕاندن، ژبینا فۆلکلۆریک و ئەدەبی دناڤ کوردان دە
ژ بێتامی و رژیتیێ پاراستنە، وەک دەستانا فەرهات و شیرین ....
ئانگۆری چەند چاڤکانییان، فەرهات ب خوە ژ مالباتەکە کوردی
هاتییە[6]. لێ دەستان ب خوە گەلۆ د ناڤ کوردان دە چما ئەوقاس بەلاڤ
نەبوویە؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ ژی گەلەک بالکێشە. دەنگبێژ و دەستان
بێژێن کورد، گەلەک دەستانێن رۆهلاتێ ب مۆتیفێن کوردی ڤە دەولەمەند



کرنە، خەملاندنە، ل گەلەک جیهێن کوردستانێ شاخێن ڤان دەستانان
پەیدا بوونە. ژ ناڤ دەستانان و شاخێن وان بەشەک هاتییە بەرەڤ کرن،
ئێدی بوونە کەریکی ئەدەبییاتا کوردی یا ئانۆنیم. لێ بەلێ ڤێ لێکۆلینا
مە یا ب سینۆر کری، وەک خەبات، ئارمانجەکە وسان فرەهـ نەدایە پێشییا
خوە، ژ بۆ کو هەموو دەستانێن کوردی یێن ناسکری شاخێن وان یێن
فۆلکلۆریک - ئەدەبی پێشکێش بکە، رووبەری هەڤ بکە - ئەڤ خەباتا
مە د ڤی واری دە تەنێ گاڤەکە، بێگومان گاڤەکە پێشین و پچووکە، ژ
کورتە نۆتان پێک تێ، دڤێ گاڤێن مایین بێن پێکۆلکرن. ژ بەر لێکۆلینێن
ل سەر دەستانێن کوردی، نەتەنێ پرۆبلەماتیکا فۆلکلۆرا کوردی، وسان
ژی دکارن گەلەک پرسێن، ئەدەبی چڤاکی، ئەتنۆگرافیک، دیرۆکی رۆنی
بکن، سینۆرێن ڤان وارێن لێگەرینان نێزیکی هەڤ بکن.

## دەستانێن کوردی دە ستروکتورا بنگەهین:

### دژایەتییا سێسەری

د دەستانێن کوردی دە بابەتا کو بالا مە زێتر دکشینە ل سەر خوە، ئەڤ
بەرهەمان وەک سەرپێهاتییێن ئەڤینداریێ یێن رۆمانتیک ل سەر سینۆرێن
مرن- کوشتنێ شاخ ڤەددن، ب ڤان بوویەرێن رووسار، خەمگین و نەدلشاد
ڤە خەلاس دبن. بەشێن ڤان بەرهەمان یێن فینالێ، ئەنجامێ گەلەک
دراماتیکن. باییس و سەدەمێن پێشکەتنا ڤان بوویەران، ب باوەرییا مە،
د ناڤ ڤان دەستانان دە پەیدابوونا رەکابەتا ب دەستخستنا ژنێ یە. ب
تایبەتی دوو مێر (دلکەتی) دبنە ئەڤینداریێ کەچەکێ، ب کەچەکێ ڤە دبن

سێ کەسان، ئەڤ پێوەندییێن سێسەری - سێبەر دەمەک تێ، ئێدی هەر دچن بەر ب خرابییێ دمەشن. ژ ڤان هەرسێ کەسان رە تو رێکە خەلاسییێ نامینە. ژ هەر دو راقیبێن مێرین یەک تو گاڤەکێ شوندا ناڤێژە، هەبوونا یەکی تونەبوونا یێ مایین ب خوە رە تینە. جار جار هەم ژن، هەم ژی دلکەتییێ یەکەمین د ڤی شەرێ سێسەری - سێبەر دە تێن کوشتن ئان ژی، ژ قەهرا دژوار-ییێن مایین جان ددن، دمرن. راقیبێ دووەمین چاوا ئەم دبینن، پێویست نینە دلکەتیک بە، جار جار ژی ئەو دێ - باڤ، ئاپ ئان ژی هێزێن مایینن، ئەو ژی نگێ دلکەتییێ یەکەمین و ژنان دخنە سۆلەکە تەنگ، دژواری و سەرئێشییێن مەزن پەیدا دکن، ژ بۆ کو دو دل نەبن یەک، گەلەک جاران ژی خوین درژە ئان ژی دلکەتیک ژ بەر ئێش - ژانا دلان دمرە. د دەستانێن کوردی دە بێگومان گەلەک ستروکتورێن مایین ژی هەنە، لێ بەلێ ستروکتورا هەرە بالکێش ستروکتورا درامێن سێسەری ئان ژی سێبەرن.

د داوییا دەستانێن کوردی دە ئەڤینا دو دلان گەلەک جاران دبە سەرگێژی و سەرئێشیکە مەزن، ژ بۆ چارەسەرکرنا ڤان سەرئێشیان چاوا ئەم دبینن مێرخاسێن ڤان دەستانان جانێ خوە ددن، دبن گۆری، دناڤ ڤان گۆرییان دە هەژمارا ژنان زێترە، ژ بەر کو ئەو د بن زۆردەستیکە مەزن دە نە، دناڤبەرا دو ئاڤان دە دبینن، نزانن چ بکن و دحەلن دچن، مرنێ وەک رییەک خەلاسییێ هلدبژێرن. د دەستانا شێخ فەرخ و خاتوون ئاستی دە هەرچقاس مۆتیفێن پرۆ-ژنین هەبن ژی، ب تایبەتی مرنا ئاستییێ، ڤێ ستروکتورا پێوەندییێن دلکەتییان گەلەک ڤەکری نیشان ددە، ب تایبەتی بەشا داوییێ. دەما فەرخ و ئاستی مەزن دبن، دلێ وان دکەڤە هەڤ، چاوا ئەم ژ دەستانێ فێر دبن، ئەو گەلەک ژ هەڤ حەزدکن. دلێ یەکی ب ناڤێ



ئوسۆ ژی دکەڤە ئاستییێ، ئەو هەرتم ل پەی ئاستییێ یە. دوو خووشکێن ئاستییێ ژی هەبوونە، ناڤێ وان ناز و نازدارن. رۆژەکێ ئەڤ هەر سێ خووشک و فەرخ ب تەڤایی دچن حەوز، ئاڤژەنی دکن، خوە رووت تازی دکن دکەڤنە ئاڤێ. ژ بەر کو فەرخ ئاڤژەنی نزانبوویە، ئەو ل قراخا حەوز دسەکنە، ل وان مێزە دکە. پشتی دەمەکێ باڤێ ئاستییێ، ژ کەچا خوە دپرسە وەکی ئەو دخوازە مێر بکە ئان نا، ئەگەر دخوازە، ب کێ رە؟ کەچا وی هەر چقاس دبێژە ئەز مێر ناکم ژی، پاشێ باڤ ژێ دەردخە کو دلێ وێ د فەرخ دە هەیە، د بێژە ((ئەڤین ژ خوەدێ یە)) و کەچا خوە ددە فەرخ. فەرخ پاشێ دچە بەغدایێ، دەمەکە درێژ ل ور دمینە، ئاستی ژ دەردێ فەرخ کەر- گێژ دبە. رەوشا باڤێ ژی خراب دبە، ژ بەر نەچارییێ مەجبوور دمینە کەچا خوە ئاستییێ ددە شڤانێ خوە، ناڤێ وی شاخۆل بوویە. فەرخ ب ئالیکاریا قولنگان ب ئاستییێ رە دەنگ دکە، ژێرە نامان دشینە. ژ دەردێ دلان، ئاستی نەخواش دکەڤە، پشتی دەمەکێ ژی دمرە، وەک دەستانا لەیلا و مەجنوون ئەو کنجێن لەیلایێ خوە دکەو خوە رەش گرێ ددە. پاشێ فەرخ ڤەدگەرە، بەری کو بێ جیهێ مالا باڤێ ئاستییێ، ئەو راستی شڤانەکی تێ، ئەو شڤان شاخۆل بوویە، شڤانێ کو ئاستی بێدل گرتنە دانێ. پاشێ فەرخ ژ ڤی شڤانی فێر دبە کو، ئاستییێ جان دایە، چوویە دلۆڤانییا خوە. دەستان، ب ڤێ خەبرا ترش و تال ڤە خەلاس دبە، ئێدی ئەم پێ نزانن چ تێ سەرێ فەرخ؟ پشتی مرنا لەیلایێ چاوا مەجنوون ژی دمرە، سەدی - سەد دنیا فەرخ ژی سەرۆ - بنۆ دبە. کەس ئاستییێ ناکوژە، ئەو ب خوە جان ددە (٧). لێ بەلێ دەما مرۆڤ رەوشا ئاستی دناڤ دە مایە، مێزە دکە، وێ چاخێ مرۆڤ دبینە کو ئەو نەمرییە، دەردێ دلان ئەو کوشتییە، ئەو هاتییە کوشتنێ. ژ بەر کو بەری نەخواش بکەڤە،

جان بده، ئەو ب خوە رە شەڕ دکە، ب مەرجێن دوربەرێ خوە ڤە شەڕ دکە، بەر خوە ددە، ئێدی دۆرا وێ ئەوقاس تەنگ دبە، دنیا وێ تاری دبە، تو رێکە خەلاسییێ نامینە، نکارە ژ ئێشا دلان بفلتە. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی مرۆڤ نکارە بێژە ئاستی مرییە، ب راستی ئاستی هاتییە کوشتنێ. ب ڤێ پرسپەکتیڤی، ب ڤێ نێرینێ ڤە مرۆڤ رەوشا کو ژن دناڤ دە نن، چێتر و باشتر فام دکە.

تشتێ هەری بالکێش، د ناڤ ڤی شەڕێ سێسەری و دژوارییێن مەزن دە چاوا ئەم دبینن ژنێن کورد دیسا ژی یا خوە دکن، مرنێ ژی تەڤ هەموو ریسک و تەلوکەیان ددن بەرچاڤان، ژ بۆ کو بگهێژن بەخت و مرازێن خوە، ئەو هەر رییێن خەلاسییێ دجەربینن، باوەرییا خوەوندا ناکن، دلکەتییێ دووەمین، دێ – باڤێ خوە، ئاپێن خوە و هەموو هێزێن مایین یێن کو ل پێشبەری دلشاهییا وان دبن ئاستەنگ، داڤێژن ئالیکی و رییا خوە دە دمەشن. ئەڤ بابەتا، د تەکۆشینا خەلاسییا ژنان دە وەک گاڤەکە گرنگ دکارە بێ حەسبین. د هەموو دەستانێن کوردی دە ئەڤ تەکۆشینا ئازادییێ، وەک مەسازێن پرۆتەستۆیێ و وەک رووەشکرنا عەرف – عەدەتێن کەڤن، ل دژی هێزێن فئودال، هێزێن زۆردار ب راستی هێژایی پەیدانییێ یە. د دەستانێن کوردی، د سەر پێهاتییێن کوردی دە، بەشەکە پرۆبلەماتیکا خەلاسییا ژنان ژی، رەڤە نەرەڤا ب زۆرێ، رەڤا ژ دو دلان پێکهاتی. دەما کەچ ژ خەلاسییا خوە رە رێکی نابینە. ڤێ جارێ ب دلکەتییێ خوە رە درەڤە، ب گۆتنەکە مایین هەڤ درەڤین، دەما مرۆڤ ل سەر ڤێ ستروکتورا خەلاسییێ دفکرە، مرۆڤ دبینە کو رەڤ ژ ئالیکی دە پرۆتەستۆکرنا پێوەندییێن نەمرۆڤی و پاشتامایی یە، کاکلێ تەکۆشینا خەلاسییا (ئەمانجپاتۆن) ژنێ یە، ژ بەر ڤێ یەکێ ژی هەر رەڤەک، د ناڤ ڤان



مەرجان و رەوشێ دە رییا خەلاسییا ژنان فرەه دکە، رییا زەواجێ بێدل دختمینە، زیهنییەتێن پاشڤەروو درزینە، دقەلێشە و بووش دکە. هەر چقاس د داوییا رەڤێ دە سەر ئێشییێن نووە (کومپلیکێشن) پەیدا بن ژی، دیسا ژی، د ڤی واری دە گاڤا هەرە چێتر رەڤە، ژ بەر کو تو رێکە مایین نامینە، دۆرا جۆتان تێ گرتنێ، چەمبەرا زۆر دەستییێ هەر دچە تەنگ دبە، د چەند سەرپێهاتییان دە چاوا ئەم دبینن ئێدی رۆژ، رۆژا رەڤێ یە، د سەرپێهاتییا حەسەنێ مووسا دە رۆژێن رەڤێ نێزیک دبن، نەفرەتا ل دژی باڤ هەر دچە زێدە دبە:

وەلە ب خوەدێ من ددنێ – من نادنێ
من نادنێ ئەزێ کنجێ خوە بشینم
سەر بۆیاخێ رەشکرنێ،
ئەزێ مارا مێرا پشتی چاڤێ رەش و بەلەک،
ل خوە حەرام کم ل دارێ دنێ
دە هەی واخ مالا منێ
سالا تورنێ مالا مووسا قەتییا ژ چوویینێ، ژ هاتنێ،
جلێ مالا باڤێ من قەتییان ژ دانینێ ژ راخستنێ
گوهێ دێکا من قول کرن ب گالگالێ، ب گوتنێ ......(٨).

ئەڤ بەرخوەدانا ڤێ کەچا ب ناڤێ هەدۆ، گاڤەکە گەلەک رادیکال دکارە بێ حەسبین. حەسەن کەسەکی غەریب بوویە، دچە گوندێ مالا قاسۆ جیوار دبە و دلێ وی دکەڤە کەچا وی هەدۆ، ژ بەر کو کەسەکی خزان و کەسیبە کەچکێ نادنێ، پاشێ ب هەڤرا درەڤن، چیرۆک هەر دچە درێژ دبە. د هەر دەستان، هەر سەرپێهاتیکە کوردی دە نەفرەتەکە مەزن ل دژی زەواجێن بێدل هەیە، د سترانەکێ دە ئەڤ هێرس و رک دگهێژە خزەمێن

پۆزا، وان دلڤین، کەچ ناخوازە وێ بدن ڤان کەسێن ل مالا وان بەرەڤبوویی، هاتنە خازگینی:

خازگینچییێ ل مالا باڤێ من روونشتی
قەلەندێ من دگۆت، خەلاتێ من دبری
خزەمێ پۆزێ من مینا چەرخا فەلەکێ ل هەڤ دزڤری[٩].

دەما مرۆڤ دەستانا مەمێ ئالان و زینا زێدان (مەم و زین) مێزە دکە، تشتێ بالا مرۆڤان زێتر دکشینە سەر خوە، بێگومان پرسا ئازادییا ژنانە. زین، د ڤێ دەستانێ دە نیشانا ئازادیێ یە. ئەڤ کەچا کورد، ژ بۆ کو بگهێژە مرازێ خوە، ل دژی برایێ خوە میرێ جزیرا بۆتان، فەند-فێل، دەک-دۆلاڤێن بەکۆیێ ئەیان ب خورتی رادوەستە، ڤان پێوەندییێن نەمرۆڤی ب مرنا خوەڤە پرۆتەستۆ دکە. ئەڤ سەرهلدانا کەچەکێ ل دژی میرەکی کارەکی ئەوقاس بچووک و هێسانینە. دیسا ژی ئەو یا خوە دکە، ژ بۆ ئەڤینێ کەر-گێژ دبە، د داوییا دەستانێ دە چاوا ئەم دبینین، ئەو ڤێ دنیایێ پرۆتەستۆ دکە و ژێ بار دکە، جان ددە.

د دەستانا مەم و زین دە تشتەکی بالکێش یێ مایین ژی، دەما مەم دچە دیتنا زینێ، دبە مێڤانێ هەرسێ بران (حەسەن، چەکۆ، قەرەتاجین)، ئەڤ بران ئەوقاس بینتەنگ و عاجز نابن، چاوا تێ زانین زین دەرگستییا برایێ بچووک، چەکۆ یە، ئەو سێ سالن دەرگستینە. دەما مەم قوتییا دلێ خوە ڤەدکە، قالا زینێ دکە، دڤێ مالێ دە ئەم راستی تو سەرهشکی، نەرازیبوون، دەخەسی (کومرەشی)و سەرهشکیکێ نایێن. د ڤێ بەشێ دەستانێ دە تۆلەرانس، نەرمایێ و هەڤتێگیهشتنەکە بێهەمپا پەیدا دبە سەری شکاندن، چاڤ دەرخستن، پۆز ژێ کرن نایێ بیرا تو کەسی، هەر تشتی ب حەمدی خوە دمەشە. چەکۆ ژی تەڤ، ئەڤ هەرسێ بران ناخوازن



سەر ئێشییێن مەزن پەیدا ببن (هەر چقاس زین دەرگستییا وی بە ژی).
ئەز باوەر دکم ، د دواییێ دە چەکۆ ژی تێدگهێ، وەکی دەما زین یەکی دنێ دخوازە، وێ چاخێ تشتەکی مرۆڤ بکە ئێدی نەمایە، ئەو وسان دفکرە، ژ ئالییێ دن ئەڤ هەرسێ برا ژی دەرهەقا مەم دە دگهێژن باوەریکێ: «... ژ بۆ ئەڤینەکێ وەلاتێ خوە بەردایە»[١٠] ئەو خۆرتێ کو ژ یەمەنێ[١١] رێ دکەڤە دلەزینە، هەسپێ خوە چارگاڤا داژۆ، وەکی زووترەکێ داکەتییا خوە ببینە، تەمپۆیا ژیینێ د دەستانێ دە ژ یەکتەن بلند دکە، ناخوازە ئاگرێ ئەڤینێ ڤەمرە، دخوازە ڤی ئاگری بکە ئاگرەکی هەردەمی د ژیینا کەچ-خۆرتان دە. ژ بەر ڤان راستییان ئەڤ هەرسێ برا ژی، ب چاڤەکی فلۆزۆفیک هێژا بوونا ئەڤینێ دپیڤن، دنرخینن، ئەڤینێ ل سەر هەر تشتی رە دبینن، ئەڤ هەر سێ بران ئانگۆری ڤان رەئالیتان پێوەندییێن خوە ب مەم ژی نووە ڤە جارەکە دن بەرچاڤ و سەرراست دکن. ژ ئالییێ دن ژنا برایێ مەزن حەسەن ئەو ژنا ب ناڤێ ستی هەموو ئیمکانان ژ مەم رە ئامادە دکە، حەسەن، مەم دبە «هێلا ژنان»، ناسییا وی و ژنان ددە هەڤ. د دەستانێ دە رۆلا ستییێ تم و تم قەنج و پوزیتیفە. حەسەن و ژنا وی دخوازن ژ هەڤ ئەڤینیا ڤان هەردوو دلکەتییان رە ببن ئالیکار، تو ئالتەرناتیفەکە مایین نابینن. د ڤێ بەشێ دەستانێ دە حورمەتەکە مەزن ژ بۆ ژنان پەیدا دبە. دەما زین بریارێ خوە دگوهرینە-چەکۆ بەردە، دلێ وێ دکەڤە مەم - ئەڤ بریارا دژایەتیکێ دناڤ ڤێ مالباتێ دە پەیدا ناکە. هەموو ئەڤ یەکان نیشان ددن کو، گۆتن «گۆتنا ژنان» بوویە.

د دەستانێن کوردی دە گەلەک جاران ئەم راستی رێچا رووچک و سورەتێن جڤاتا مادەرشاهی جڤاتا کو باندوورا داییکان - ژنان لێ زێدەیە - تێن. د چەند دەستانان دە سەردەستییا ژنان زێترە، ئەو خوە نادن

هنجراندن، ئێشاندن و زێراندنێ. ئەو د هەر وارگێ ژیینێ دە خوەدی مافن. سەربەستن. د دەستانا لاز و خەزال دە، ئەم راستی جڤاتەکە وسان تێن کو ل سەر ژنان تو زۆر دەستیکە وسان بەربچاڤ، نایێن دیتن. خانزاد، پشتی مرنا باڤێ خوە دبە سەرۆکا عەشیرا بالەکیيا، هەژمارا مالباتێن ڤێ عەشیرێ هەزار و هەفسەد بوویە، هەموو رێڤەبرنا کارێن عەشیرێ دکەڤە ل سەر ملێن وێ. ئەڤ یەکا ژی نیشان ددە کو د سالێ گەلەک کەڤن دە سەر دەستیەکە ژنان هەبوویە.

د دەستانا لاز و خەزال دە ڤێ جارێ ستروکتورەکی پێوەندییێن جودا پەیدا دبە. ڤێ جارێ دو کەچ (خانزاد و خەزال) دبن ئەڤینداری لاز. ژ دەر پەڤچوونا سەر کەچان، ڤێ جارێ ئەم راستی پەڤچوون ئان ژی رەکابەتەکە لە سەر خۆرتان تێن هەردو کەچ ژی ب ئاکتیفی. تەڤی ڤێ رەکابەتێ دبن، گرانی و باندوورا نیشان ددن. ژ بەر ڤێ یەکی ژی ئەڤ دەستانا ژ دەستانێن کوردییێن مایین پاریکی جوداترە. لاز و خانزاد کورئاپ و دۆتمامێن هەڤن، نیشانییا وان دبە، پشتی مرنا باڤێن لاز و خانزادێ، رێڤابرنا کارێن مالباتێن عەشیرا وان دکەڤە ل سەر ملێ خانزادێ (نیشانییا لاز) ژ بەر کو لاز ڤێ نیشانییا خوە بەردده، ڤێ جارێ دبە ئەڤینداری کەچەکە ژ عەشیرەکە مایین، ناڤێ وێ خەزالە. دلێ وان گەلەکی دکەڤە هەڤ، نازەوجن، لێ ب هەڤرا رادزێن، ب هەڤرا د مینن. دناڤبەرا ڤان هەردوو کەچان دە بڤێ - نەڤێ دلساریک پەیدا دبە، لێ بەلێ هەردوو ژی هەتا مرنا لاز پێوەندییێن خوە، سلاڤێن خوە ژ وی قووت ناکن . ئەڤ هەردوو کەچ هەرچڤاس ژ هەڤ سار بوونە، دژی هەڤن و ناخوازن لاز ژ دەستێ خوە دەرخن ژی، دیسا رۆژا مرنا لاز، دشینا وی دە بەشدار دبن، ب تەڤایی هلددن، دکنە گۆڕا وی، پاشێ خانزاد لێدخە دچە ناڤ عەشیرا خوە، خەزال



ل ور دمینە(١) دەستانا لاز وخەزال، ژ ئالیکی دە وەک دەستانا فەرخ و ئاستی یە، د هەردوو دەستانان دە دژایەتیکە سێسەری هەیە، د دەستانا فەرخ و ئاستی دە ستروکتورا مێر-ژن-مێر، دە دەستانا لاز و خەزال دە ستروکتورا ژن-مێر-ژن، پێوەندی و بوویەرێن کو د ڤان دەستانان دە هەنە، دبن باندوورا خوە دە دهێلن. ژ هەڤ جهێ دکن. ژ ئالییێ دن د هەردوو دەستانان دە ئەڤینداریکە رومانتیک هەیە، هەردوو دەستانان وەک ستران، د لۆک و هەلبەستان گەلەک لیریکن. ژ ئالییێ دن، د سالێن کەڤن ناڤ جڤاتا کورد دە ژ بۆ رۆنیکرنا جیهێ ژنان، گەلەک هینکار و رێنیشاندارن.

## دژمنێن دو دلان و چار چاڤان

بێبەختی، نۆکەری، خایینتی، دلرەشی و فێلبازی وەک ئەلەمەنت-مۆتیفێن نەگاتیف د دەستانێ کوردی دە گەلەک جاران دبن سەدەمێن بێمرازی و بەدبەختییێ. د دەستانا مەم و زین دە، سەرپێهاتییا بەکۆیێ شەیتان، چاوا مە ل ژورێ ژی گۆت، د ژیینا مەم و زین دە دبە سەدەمێ فەلاکەتەکە مەزن. د دەستانا شۆر مەحموود و مەرزنگان دە، ئەڤ هەردو دلکەتی ژی دبن گۆرییێ دەک-دۆلاب و فەند-فێلان. ئانگۆری دەستانێ شۆر مەحموود و مەزرنگان د زارۆکتییا خوە دە دەست پێ دکن هەڤ حەز دکن، ب هەڤ رە مەزن دبن و د داوییێ دە دزەوجن. شۆر مەحموود دبە کەسەکی گەلەکی ژیر و مێرخاس. ئاپێ وی مامەرەش مێزە دکە، شۆر مەحموود هێدی هێدی دبە تەلوکەکێ ژ بۆ وی. ئەو دترسە، وەکی رۆژەکێ شۆر مەحموود سەرکارییا ئێلا وی تێخە دەستێ خوە و وی بێ روومەت بهێلە. دەمەک تێ شۆر مەحموود دخوازە دەرگستییا خوە مەرزنگانێ هلدە

هەرە. ئاپ ناخوازە مەرزنگانێ بدێ. گەلەک دفکرە، د داوییێ دە دبێژێ، ئەگەر تو هەری شەر زۆرا دژمنێ من ببی، ب سەرفراز ڤەگەری ئەزێ مەرزنگان بدمە تە. دەما شۆر مەحموود ژ شەڕ بە سەرفرازی ڤەدگەرە تێ، پشتی چەندەکی دەما ئەو ژ خوە رە دچە نێچیرێ، مامەرەش ژ ڤێ هەرێمی مالا خوە باردکە دچە، وەلاتەکی ماین، مەرزنگانێ ژی دبە، دەستێ ئەڤینداران ژ هەڤ دقەتینە. د رێ دە مەرزنگان ب دزی دچە ل سەر پرەکێ، ژ کەندالەکی دە خوە داڤێژە ناڤ گێژاڤێ دخەنقە، بەری کو خوە باڤێژە ئەو ب پرەڤان رە دەنگ دکە، وەکی ئەگەر یەک بپرسە برا بێژە مەرزنگانێ خوە ئاڤیتە گێژاڤێ، پاشێ شۆر مەحموود تێ وەکی مەرزنگانێ خەلاس بکە، ئەو ژی خوە داڤێژە ناڤ ئاڤێ، ئاڤژەنی نکاربوویە بکە، د داوییێ دە ئەو ژی دخەنقە. دەما باڤێ وێ پێ دحەسە تێ ل دۆر ئاڤێ ژ پرەڤان دپرسە، وی مەرزنگان دیتییە ئان نا؟ پرەڤان ڤێ بەرسیڤا ژێرین ددە!

برا دەردێ من گرانە،
نزانم ل کێ بکم نفرانە،
ڤیزا تو دبێژی ناڤێ وێ، مەرزنگانە،
راوەستا بوو ل بەر ڤان ڤراخانە،
نفر دکرن ل داییک و باڤانە،
ژ دەردێ ئەڤینداریێ خوە ئاڤیتە ناڤ پێلێن ڤان ئاڤانە،
ژ بەر وێ شۆر مەحموود ژی خوە ئاڤیتە ناڤ گێژاڤانە،
نها گۆڕا وان بوویە زکێ ماسییانە(١٣).

هەفت خارزیێ مامەرەش هەبوونە گەلەک مێرخاس و جەنگاوەر بوونە، گەلەک شۆر مەحموود حەز دکرن. دەما ئەو دبیسن ئەڤ بەلا مەزن هاتییە



سەرێ شۆر مەحموود و مەرزنگانێ، هەسپێن خوە سییار دبن، دچن پێسیرا مامەرەش دگرن، ب شوور و خەنجەران وی پارچە پارچە دکن. پاشێ دچن جەنازێ وان ژ ناڤ ئاڤێ دەردخن، مێزە دکن ئەڤ هەردو دلکەتی د پاشلا هەڤدا، هەڤ هەمێز کرنە. ژ وان رە دەواتەکە ب ناڤ و دەنگ چێ دکن، دبێژن ئەو ل ڤێ دنییێ دلشا نەبوون، قەت نەبە برا ل دنیا دنێ ب هەڤ شا بن.

چاوا تێ خویان، ئەڤ دەستانا کوردی ژ ئالیکی دە وەک دەستانا مەم و زین داوییێ دە دبە دەستانەکی بێمرازان، د دەستانێ دە خایینتی و بێبەختی تێ پرۆتەستۆ کرن، ل دژی نەپاکی، نەقەنجییێ دەنگێن گەلەک خورت هەنە. ب تایبەتی خوە خەنقاندنا مەرزنگانێ دڤی واری دە وەک پرۆتەستۆکە مەزن دکارە بێ حەسبین. د دەنێنانێ دە دیتناسییا کەسێن وەک مەمەرەش یێن خایین تێ روورەش کرن.

## چەند کەچپەری و پیرەژن

د دەستانا مەمێ ئالان و زینا زێدان و چەند دەستانێن ماین ژ دەر مێرخاسێن مرۆڤی، ئەم چەند مێرخاسێن وەک جن، کەچپەری و کەسێن نەخویانبار ژی دبینن، ئەو دکەڤنە دلقێ (رۆل) ژنان، د دەستانان دە رۆلەکە ئالیکاری و پشتەڤانییێ دلیزن، وەک پیرهەڤۆکا ب ترس و خۆف نینن. ئەڤ مێرخاسێن چیرۆکی، پێوەندییێن دلکەتییان رە گەلەک جاران دبن ئالیکار، ناسییا وان ددن هەڤ، ب تایبەتی ڤان دلکەتییان دخن خەونێن هەڤ. د دەستانا مەم و زین دە ناڤێن سێ کەچکێن پادیشاهێ پەرییان دەرباس دبە: تاڤبانۆ، هیڤبانۆ، ستێربانۆ، ئەڤ کەچێن دلسۆز و ئەڤینپارێز بریار دگرن کو بفرن هەرن جزیرا بۆتان، ئەو دچن دکەڤن ئۆدا زینێ، وێ

هلددن تینن دخن خەونا مەمێ. پشتی ڤێ بوویەرێ مەمێ، ل سەر زینێ دبە ئەڤیندار و کەر - گێژ دبە. چاوا د دەستانێ دە تێ خویان، ئەڤ هەرسێ کەچێ پەرییان گونەیێن ڤان هەردوو کەچ-خۆرتان (مەم و زین) هلددن ل سەر ستوویێ خوە. د دەستانا سێڤا هەچی دە ژی، ئەم راستی چەند کەچێن وەک ڤان پەرییان تێن، د شاخەکێ ڤێ دەستانێ دە ناڤێ یەکێ گولچیچەکا دلان[١٤]، د شاخەکە مایین دە ناڤێ وێ پیرامرازا [١٥]و د شاخەکێ دە ژی قیزا قەنج[١٦] دەرباس دبە. گولچیچەکا دلان، دچە مەحموودێ جندی تینە، دخە ئۆدا سێڤا حەجی، وان ب هەڤ ددە ناسین. ئەڤ پەرییێن ژنین (فمینین)، د چەند دەستانێن مایین دە ژی چاوا ئەم دبینن ئەنینڤیس، بەخت و مرازێ کەچ و خۆرتان ئایین دکن، ئەڤین، مەرهەمەت و ئالیکارییێ ل سەر مرۆڤان دە دبارینن. ژ دەر ڤان پەرییان، د چەند دەستانێن مایین دە، ئەم راستی چەند مۆتیفێن وەک پیر و پیرەژنان ژی تێن کو مرازان دگهینن هەڤ، د پێوەندی و کۆنتاکتێن ناڤبەرا ژن - مێران دە رۆلەکە ئاکتیڤ دلیزن، گەلەک ریسک و تەلوکایان ژی ددن ل بەرچاڤان، خوە داڤێژن ناڤ ئێگر، و ناڤبەرا دلکەتییان دە، ژ بەر کو زێدە شک ناچە ل سەر وان، خەبەران دبن - تینن و دبن چاڤکانییێن ئیستیخباراتێ، ژ بۆ کو سالێن وان بهورینە، تەجروبەیێن وان یێن ژیینێ زێدە نە، د ڤان دەستانان دە گەلەک جاران کەچ و خۆرت خوە داڤێژن پێسیرا وان و ئالیکارییێ ژ وان هێڤی دکن و باوەرییا خوە ژی، ب وان تینن. د دەستانا مەهر و وەفا دە، دەما وەفا دچە هەوارییا دلکەتییێ خوە - مەهر، ئەو تێ گرتن، وێ ب دارێ زۆرێ درەڤینن. د رێ دە ئەو راستی پیرەژنەکێ تێ، حال - حەوالێ خوە ژێ رە دبێژە، ئەڤ پیرەژنا ڤان گۆتنان پاشێ دبە دگهینە مەهر[١٧]. د دەستانا رۆستەمێ زال دە، رۆستەمێ زال بەری کو باڤێژە ل سەر دژمنێن خوە، جارا پێشین دبە مێڤانێ ڤان پیرەژنان.



ب کورتی د دەستانێن کوردی دە ئەڤ فیگورێن ژنین یێن کو د بەشەکە ڤان دەستانان دە. دەردکەڤن پێشبەری مە، د وارێ پێکهاتنا کۆنتاکتێن گرنگ دە جیهەکی یەکەمین دگرن و رۆلێن ئاکتیف دلیزن.

## ژن د رێکە راست دە دمەشن

د دەستانێ کوردی دە دوور دیتنییا ژنان، چاوا د ڤان بەرهەمان دە دییار دبە، گەلەک تووژە. ژ بەر ڤێ یەکێ دە ژی، ئەو د رێکە راست دە دمەشن. پشتی دەستانا مەمێ ئالان و زینا زێدان دەستانا کو د ناڤ کوردان دە زێتر بەلاڤ بوویە، دەستانا سییابەند و خەجێ یە. دەستان، ل سەر ئەڤینا سییابەندێ سلیڤی و خەجا رەسوول ئاڤا دبە. وەک گەلەک دەستانێن مایین، د ڤێ دەستانێ دە ژی سییابەند و خەجێ ناگهێژن مرازا خوە. لێ بەلێ ئەو ئەڤینا کو د ڤێ دەستانێ دە پێل-پێل مەزن دبە، هەموو دژواری، خرابی و تشتێن نە چێ دبن سیبا خوە دە دهێلە، وان دفەتسینە، بێرووەمەت دکە. دەما مرۆڤ ڤێ دەستانێ باش ئانالیز دکە، مرۆڤ تێدگهێ کو مێرخاسا ژنین-خەجێ پێشەرۆژێ ئانگۆری سییابەند باشتر دبینە و گاڤێن خوە ب پیڤان داڤێژە. د بەشەکە ڤێ دەستانێ دە خەجێ خەونەکێ دبینە و دکەنە، ڤێ خەونا خوە ژ سییابەند رە شرۆڤە دکە، سییابەند بێسەبەب، ڤێ خەونێ شاشی فام دکە، پەی وان پەزکوڤییێن کو خەجێ د خەونا خوە دە دیتنە، دکەڤە. کەن و گۆتنێن خەجێ شاش فام دکە، هلددە ل سەر خوە، دلتەنگییا خوە زوو ئەشکەرە دکە، ڤی کەنی ب کەچەلییا خوە رە گرێ ددە، ژ ناڤ وان درر نز دەها پەرکوڤییان یەکی دکرە دکوژە، پەز کوڤی ژی لێدخە ژی لێدخە وی کەندالەکی دە داڤێژە، دکوژە، پاشێ ناڤێ

وی دبه. نێچیرڤانێ کو ژ ئالییێ نێچیرا خوه تێ کوشتنێ. ئەڤ بەشا داوین یا دەستانێ، مەساژا دەستانێ گەلەک ب ڤەکری رادخه ل بەرچاڤان، سیبابەند خەلەتییا خوه، ب زمانێ خوه ئەشکەره دکه:

«چاوا من ژ هەڤ قەتاندییە دەستێ نێری و بزنێ ئەوی وسا ژ هەڤ قەتاندییە دەستێ مێر و ژنێ[١٨].

دەما سیبابەند دخوازە نێری بگرە، وێ دەمێ نێری و بزن ل بال هەڤ بوونە، زرارەکە وان نەگیهیشتییە تو کەسی. ئەڤ سەرهشکییا سیبابەند ژ کوو تێ؟ چاوا ئەم ژ دەسپێکا دەستانێ دە فێر دبن، زارۆکتییا وی قەت باش دەرباس نەبوویە، بێدێ و بێباڤ مەزن بوویە، د زارۆکتییا خوە دە کەسەکی شەرووت بوویە، ب دۆربەرێ خوه، ب هەڤالێن خوه رە زێدە ب هەڤ نەکرییە، وەک میسال رییا ژنا گاڤانێ گوند دگره ... ژ ئالییێ دن ئەو کەچەل-گورِی بوویە، بێگومان وی ئەڤ یەکا وەک کێماسیکێ د خوە دە دیتییە و خواستییە ڤێ کێماسییێ ب تەحرەکی مایین، ب رێکە دن تژی بکە. ب چ تەحری؟ سیبابەند چاوا ئەم دبینن دبه کەسەکی پروبلەماتیک، ئەڤ شاهسییەتا وی یا پارچە کری د داوییێ دە دبه باعیسێ مرنا وی ومرنا خەجێ ژی. خەجێ ناخوازە وەکی سیبابەند هەرە وی پەزکوڤییی بکوژه، گونێ وێ ب ڤان پەزکوڤییان تێ، لێ بەلێ سیبابەند وێ گوهدار ناکه، یا خوه دکه.

ئەڤ سەرهشکییا سیبابەند، د دەستانا کەرِ کولک دە سەرهشکییا ڤان هەردو برایان تینە بیرا مرۆڤان. د ڤێ دەستانێ دە دیبیا ڤان هەر دو کوران ناخوازە وەکی کورێ وێ هەرن ب هەر هەفت برایێن وێ رە شەرِ بکن، لێ بەلێ ئەو گۆتنێن دیبیا خوه گوهدار ناکن، دچنە شەرِ. چاوا تێ زانین د داوییا دەستانێ دە کولک تێ کوشتن، گۆتنێن دیبیا وان وەردەکێ راست



دەردکەڤن. دووردیتنی، راستزانین و فامدارییا وەردەکێ وەک خەجێ ڤێ یەکێ نیشانی مە ددن وەکی د دەستانێن کوردی دە ژنێن کورد هەرتم سەردکەڤن، د رێکە راست دە دمەشن، رێنیشاندارن، ب شیرەتێن خوەڤە پێشەنگییا مێرخاسێن ڤان دەستانان یێن مێرین دکن.

ژ ئالییێ دن، هەم د دەستانا سیبابەند و خەجێ دە، هەم ژی د دەستانا کەرِ و کولک دە زۆردەستیکە میرێن عەرەبان ژی هەیە. خەجێ بەری کو ب سیبابەند رە برەڤە، چاوا تێ زانین دەرگستییا کورِێ میرێ عەرەبان بوو. کەرِ و کولک ژی، بۆنا هەرن هەسپەکی ب ناڤێ بێجان ژێ رە بینن، ژ ئالییێ میرێن عەرەب دە تێن سەفەر بەر کرن، میرێن عەرەبان ڤان هەردو خۆرتان ل سەر خالێن وان دشینن وەکی ب خالان رە بکەڤن شەرِ. لێ بەلێ کەر ناخوازە دیبیا وی تەنێ بێخوەیی بمینە، ژ بەر ڤێ یەکێ ژی کوشتنا هەفت خالێن خوه نافکره، وێ چاخێ دیبیا وی دکارە بکەڤە دەستێ میرێ عەرەبان. ئانگۆری کولک، کەرِ چێتر دفکره و گاڤێن خوه ب پێڤان داڤێژه. د داویا دەستانێ دە، چاوا ئەم دبینن کو کولک تێ کوشتن، کەچا میرێ عەرەبان-تێلی رەوشەن خاتوون پاراکەرِ دکەڤە.

د دەستپێکا دەستانا کەر و کولک دە، دەما باڤێ وەردەکێ ناخوازە کەچا خوه بدە سلێمان، سلێمان وەردەکێ درەڤینە. باڤ پەی کەچا خوه دکەڤە، وەردەک کەڤرەکی هلددە باڤێ دخە، دکوژه[١٩].

ئەڤ یەکا ژی نیشانی مە ددە کو، دەما کەچا کورد دل کر، دلکەتییێ خوه و مرازێ خوه ژ سەر هەر تشتی رە دگرە، خوه داڤێژە ناڤ ئاگرێن مەزن، دکارن ل دژی بریارێن دێ-باڤێ خوه ژی دەرکەڤن، د ڤی واری دە گەلەک سەرهشکن وگەلەک جاران بەرخوە ددن. د چەند دەستانێن مایین دە ژی، چاوا ئەم دبینن ل دژی دێ-باڤێن نەهەق موخالەفەتەکە مەزن هەیە.

ئەڤ دێ-باڤێن نەهەق نايێن کوشتن ژی، نفرێن مەزن ل وان تێن کرن، ئەڤ نفران ئانگۆری چەند دەستانان تێن جیە ژی. د دەستانا فەرخ و ئاستی دە، فەرخ نفرێن مەزن ل دێ و باڤێ خوە دکە، د ناڤ هەفتەکی دە هەم دێ، هەم ژی باڤێ وی دمره[٢٠] بسایا مۆتیفا نفران، مرۆڤ فام دکە کو، کی دبە برايیە، پێویستیە کەس نەکەڤە ئورتا دو دلان و چار چاڤان. ئەڤ باوەری د دەستانێن کوردی دە گەلەک خورتە. چما پرانییا نفران ژ دەڤێ ژنان، ب تایبەتی ژ دەڤێ داییکان دەردکەڤن و ئەڤ نفران تێن جیە؟ بەرسڤا ڤێ پرسێ دچە دگهێژە مەزنبوونا نەهەقییا ل ژنان تێ کرن. ژن هێرس، نەفرەت و رکا خوە دپراتیکدە نین بە ژی، ب زار-زمان (ڤەربال) دیيار دکن، رەئالیتەکە ژیینێ ئیفادە نەکن ژی، وەک رەئالیتەکە زمانی، گەلەک جاران راستی رەئالیتەیێن ژیینێ ژی تێن، دبن بوویەر. ژ بەر کو کەسێن خرابییێ دکن. د پێشەرۆژێ دە چ وێ بێ سەرێ وان، مرۆڤ کێم - هندک، سەدی سەد نین بە ژی، ژێ دەردخە، ژن ب ڤێ باوەرییێ ڤە نفران دکن. ژ بەر تەجروبەیێن ژیینێ، ژن دگهێژن ئاقلمەندیکە مەزن و تەنک.

د ڤێ بابەتێ دە سەرپێهاتیکە هەرە بالکێش ژی، سەرپێهاتییا فلیتێ قتو یە. ئانگۆری ڤێ سەرپێهاتییێ ل وەلاتێ مامێ ئەتمانیک خەلا هەبوویە، وان نکاربوونە دەبار-ئابوورا خوە بکن. ئەو ژ عەشیرا رەشکۆتابوویە. کارڤانێ خوە ئامادە دکە، دچە بازارێ باتمانێ وەکی ئابۆری و دەبارا زارۆکێن خوە بکە، لێ بەلێ ئەڤ ناڤچا دبن کۆنترۆلا فلیتێ قتۆ دە بوویە، باج و بەرتیل ژ کارڤانێ کو دهاتنە ڤێ ناڤچێ دستەند، رێبرەکی ناڤ و دەنگ بوویە. دەما دبهیسە کو مامێ ئەتمانیک هاتییە هێلا باتمانێ، مرۆڤێن خوە بەرەڤ دکە، دچە ل سەر وی، شەڕەکی مەزن دناڤ وان دە دەست پێ دکە، د داوییا ڤی شەڕی دە هەم فلیتێ قتۆ، هەم ژی مامێ



ئەتمانیک تێن کوشتنێ. پرانییا سترانێن کو ل سەر فلیتێ قتۆ هاتنە گۆتن، ژ دەڤێ دییا وی شەڤی دەرکەتنە، ئەڤ ژنک، کورێ خوە نەهەق دبینە، پشتا کورێ ناکە. کرنێن وی جیە دە نابینە، هەرچقاس کورێ وێ نین بە ژی، ئەو پشتا مامێ ئەتمانیک دگرە، فلیتێ قتۆ گوهـ نادە شیرەت و گازییێن دییا خوە، د داوییێ دە تێ کوشتن و دییا وی دلۆرینە:

«فلیتۆ لاوۆ، وەرە نەچە پێشییا ڤی کەرڤانی !...[٢١].

ژ ئالییێ دن ئەڤ داییکا کورد ژ ڤی شەڕێ خوە خوەتییێ ژی نەرازی یە، ئەو زانە کو ئەڤ شەڕێن نەهەق تەنێ کێفا هێزێن دژمن، هێزێن نەیار و دەولەتێ تینە:

« ... بتلیسێ دەرگەڤانا دەرگە ڤەکر
دۆنزدە بەیراقێ عەلی-ئوسمان شەدە، ئیسپات،
شەڕێ فلیتێ قتۆ، مەمێ ئەتمێ تەماشەکر»[٢٢]

## ژ بۆ مێران دانینا چەند مەرج و هۆیان

د دەستانێن کوردی دە دەما کەسەک داخوازییا زەواجێ دکە، ژ ئالییێ ژنێ دە چاوا ئەم دبینن هن مەرج و هۆی تێن پێشکێش کرن، پێویستە مێر زیرەکی و ژیریتیکێ نیشان بدە، ئەو پێویسن یا هەرن ل سەر دژمن ئان ژی کارەکی مەزن بقەدینن. ئەگەر ئەو د ڤان سەفەران دە سەرنەکەڤن، ژ وان رە ئیمکانا کەچداییینێ نامینە. چما ئەڤ دژواری و زەحمەتی تێن پێکئانین؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ مرۆڤ دکارە ب سێ تەحری شرۆڤەکە:

أ. ب پێکئانینا موجیزەیان ڤە دەستان تەمپۆکە بلند ب دەست دخە.

ب. ب ڤان پێشدانینان ڤە، دێ-باڤ دخوازن، زاڤایێن خوە یێن نووهـ، ژن

ژی دخوران دلکەتییێن خوە بجەربینن، باشبوون و قەنجیا وان ب چاڤێن خوە ببینن.
ج. د هن کارێن پراتیک دە ژ ڤان دلکەتییێن نووە ئیستیفادە بکن.
د دەستانا کەرو کولک دە، ژ بۆ کەچا میرێ عەرەبان ژ خوە رە بخوازین، ئەو پێویستن، هەرن هەسپەکی ناڤدار ژ ناڤ عەشیرەکا مایین برەڤینن بینن. دییا وان وەردەک ژی، دەما دخوازە نامەکێ ب رێ بکە، دچە بال سۆفیکی، ب وی رە تو دبێژی پەیمانەکێ گرێ ددە، دبێژە وی ئەگەر تو ڤێ نامێ ببی بگهینی خوەدانێ وێ، ئەزێ ب تە رە مێرکم[٢٣]. د دەستانا سێڤا حەجی دە، ئەوکەسێ دلێ وی کەتییە سێڤا حەجی پێویستە هەرە جیهەکی قەیتانا مەموودی (د شاخەکە ڤێ دەستانێ دە قەیتانا هەمەدانێ تێ ناڤ کرن) بینە وەکی ژ باڤێ وێ یێ کۆر رە ببە دەرمان، ئێدی سێڤا حەجی یا وی یە[٢٤]. د دەستانا ناسر و مالمال دە، ڤێ جارێ ئەم راستی هۆی و مەرجێن مایین تێن، هەردو کەچ (تاورەزی و ئەسمەر) دخوازن وەکی ئەڤ هەردوو خۆرت (ناسر و مالمال) هەرن بەغدایێ چەند سالا بمینن، ببن کەسێن مەزن، پاشێ ب وان رە بزەوجن. بەری کو ئەو ب رێکەڤن، ئەڤ هەر چار کەچ و خۆرت د ناڤ خوە دە سۆند دخون[٢٥]. د دەستانا شۆر مەحموود و مەرزنگان دە ژی، باڤێ مەرزنگانێ ژ شۆر مەحموود تشتەکی مایین هێڤی دکە، ئەگەر ئەو هەرە دژمنێ وی بندەست بکە، ئەوێ کەچا خوە مەرزنگانێ بدە شۆر مەحموود ... وەک ڤان میسالان گەلەک مەرج و هۆیێن مایین ژی د دەستانان دە تێن پێشکێش کرن. ب کورتی مرۆڤ دکارە بێژە پێکهاتن و بجیهئانینا ڤان مەرج و هۆیان جیهێ قەلەند (نەخت) دگرە. هەموو ئەڤ مەرج و هۆیان ب چ نییەتێ هاتنە گۆتن؟ ژ دەڤێ کێ دەرکەتنە؟ ئانگۆری ڤێ ژی، دەما مێر کارێن خوە د قەدینن تێن، ئەو ڤێ جارێ دکارن راستی چەند دژوارییێن مایین ژی بێن، ڤێ جارێ سەرئێشییێن نووە د دەستانان دە پەیدا دبن، هەرتم، هەر تشت ب حەمدێ خوە نامەشە.

## چما مێر دکەڤن رۆلا شڤانان؟

د دەستانێن کوردی دە چاوا ئەم دبینن ستوونێن ڤان بەهەرمان یێن هەرە خورت ژ ئالییێ ژنان دە هاتنە دایین. ژن مێر کرنێن بێدل و رەڤا زۆرێ تو وەخت قەبوول ناکن، سال دەرباس بن ژی، ئەو نە دلشانە، دیسا ژی رییا خەلاسییێ دگەرن، تمێ بەندەوارێ ئاڤاکرنا ژیینەکە نووهن. د دەستانا بنەفشا نارین و جەمبەلییێ هەکارێ دە ئەڤ رە ئالیتا گەلەک ئەشکەرەیە. بنەفش، ژ ئالییێ دەروێشی ئاغا دە ب دەستێ زۆرێ تێ رەڤاندن. ژ بەر کو برایێن بنەفشێ ل دژی زەواجا بێدل دەردکەڤن، ئەو تێن کوشتن. دەروێش ئاغا کەسەکی زۆردار و کالە، تێ گۆتن کو ئەو نۆد سالی یە. بنەفش مرنێ ژ مال، ملکێ دنیایێ چێتر دبینە. ژ بەر کو بنەفش ئەوقاسی زێدە ژ جەمبەلییێ هەکارێ حەزدکە، ناڤێ کورێ خوە یێ دەروێش ئاغا بوویی ژی، داتینە جەمبەلی، جەمبەلییێ بچووک، ئەڤ ناڤ بێگومان نیشانا ئەڤینا جەمبەلییێ مەزنە. جەمبەلییێ هەکاری دکەڤە دلقێ شڤانان، کولاڤێ شڤانان خوە دکە، وەکی هەرە ببە شڤانێ دەروێش ئاغا، ب دلکەتییا خوە رە دەنگ بکە، وێ ببینە و برەڤینە. د داوییا دەستانێ دە ب خوە ووسان دبە، ئەو ب هەڤرا درەڤن. ب ڤێ کرنا خوە ڤە بنەفشا نارین زەواجێن بێدل پرۆتەستۆ دکە و دگهێژە مرازێ خوە.
د دەستانا بنەفشا نارین و جەمبەلییێ هەکارێ دە چاوا مە ل ژۆرێ ژی گۆت، دەما جەمبەلییێ هەکارێ دخوازە هەرە بنەفشا نارین ببینە، دکەڤە

دلقێ شڤانان. د چەند دەستانێن ماپن دە ژی ئەم راستی ڤێ مۆتیفێ تێن. چما شڤان، نە پێشەکی دن؟ ژبەر کو د ناڤ کوردان، د ژیینا رۆژانە دە کەسێ کو زێتر کۆنتاک و پێوەندییێن وی ب ژنان رە هەنە شڤانن. ب تایبەتی دانێ نیڤرۆ و بەر بە ئێڤارێ دەما پەز تێ بێرییێ. کەسێ سەرێ پەز دگرە شڤانە، ب بێریڤانان رە کۆنتاکتێن وان یێن دیرەک هەنە. مەسافا د ناڤبەرا وان دە گەلەک هندکە، ئیمکانا هەڤ دو دیتنێ، ب هەڤرا خەبەر دانێ گەلەک زێدەیە، ژ ئالییێ دن زێدە شکێ ژی نابن ل سەر خوە، ژ بەر کو ئەڤ کارێ پەزدۆتنێ ژ دو کەسان پێک تێ (شڤان و بێریڤان) کەسێ کو پەز داژۆ بێرییێ، گەلەک جاران زارۆکن ئان ژی پەز ب خوە دە هەڤ رێز دبە، دکەڤە دۆرێ، د دەستانا قەر و گولیزەرێ دە، قەر دبە والییێ سۆندوزێ، دلێ وی دکەڤە کەچەکە ب ناڤێ گولیزەر، دەما مێزە دکە باڤ کەچا خوە نادێ، ئەو دبە شڤانێ مالا باڤێ گولیزەرێ[٢٦].

بەری کو جەمبەلییێ هەکارێ خوە بگهینە دلکەتییا خوە ئەو درێ دە راستی کەسێن ماپن ژی تێ. جارەکێ دلێ کەچا شێخەکی عەرەبان دکەڤە جەمبەلی. ناڤێ ڤێ کەچکێ وەدیها بوویە[٢٧]. وەدیهە ب دلەکی نا هەزار دلی دبە ئەڤیندارێ جەمبەلی. ژ بۆ کو ئەو و جەمبەلی تمێ هەڤ ببپن، هەڤ شابن، ئەو رێکێ د فکرە، دچە بال باڤێ خوە وەکی جەمبەلی هلدە سەر کارەکی، د مالا وان دە بمینە. لێ بەلێ جەمبەلی ژ ڤێ یەکێ رە رازی نابە، چ دکە ناکە ژ دەستێ ڤێ ژنکێ نافلتە. دەمەکێ ب هەڤرا دمپن، شەڤەکێ جەمبەلی ب دزیکا ڤە ژ مالا ڤێ کەچکێ د رەڤە، تەڤی تارییا شەڤێ دبە، پەی رێچا مالا باڤێ بنەفشا نارین دکەڤە. ئەڤ سەرپێهاتییا د ڤێ دەستانێ دە وەک بەشەکە بنگەهپن جیهـ ناگرە، وەک بوویەرەکە دووەمپن دکارە بێ حەسبین. لێ بەلێ ئەڤ بەشا دەستانێ تشتەکی نیشانی ڤێ



کەچا شێخێ عەرەبان دکە، وەکی ب زۆرێ دودل نابنەیەک، ب هەڤدو دیتنەکە دەربازۆک و تەسادووفی مرۆڤ نکارە دلشاببە ئەڤ بەشا دەستانێ، بوویەرێن کو د دەستانا زەمبیل فرۆش دە دەرباس دبن تینە بیرا مرۆڤان وەک هەڤن. ژ بەر کێفا خوە، ئەڤ کەچا عەرەبان و ئەو خاتوونا کو ناڤێ وێ د دەستانا زەمبیل فرۆش دە دەرباس دبە، ژنێن دەولەمەند، ئاریستۆکرات و خۆرتخاپینۆکن. دۆربەرێن کو تێ دە مەزن بوونە، دۆربەرێن باژاری نە، گەلەک ب سەربەستی دژین.

## سینۆرێن نامووس و بێنامووسییێ

دەستانەکە کو د ناڤ کوردان دە گەلەک بەلاڤ بوویە ژی، دەستانا زەمبیل فرۆشە، زەمبیل فرۆش دەبارا خوە تەنێ ب فرۆتنا زەمبیلان (سەلک) ڤە پێک تینە، کەسەکی بەلەنگاز و کەسیبە. ئەو تاخ-تاخ، کوچە-کوچە دگەڕە، زەمبیلان دفرۆشە. کەسەکی چەلەنگ، سپەهی و خوەشک بوویە. ئانگۆری شاخەکە ڤێ دەستانێ زەمبیل فرۆش بەرێ مێرەک بوویە، دەولەمەند بوویە، پاشێ ژیینەکە سادە ژ خوە رە هلبژارتییە و خزان کەتییە. رۆژەکێ تێ باژارێ سلیڤانێ جیوار دبە، ل ڤرا خوە رە زەمبیلان دفرۆشە.[٢٨] ژ بەر چەلەنگبوون، بەژن-بالا وی، رۆژەکێ دەما ئەو دیسا کوچە-کوچە دگەڕە، راستی ژنا میرێ باژێر تێ، دلێ ڤێ ژنکێ دکەڤە زەمبیل فرۆش و پێسیرا وی بەرنادە. زەمبیل فرۆش ب خوە ژی کەسەکی خوەدی ژن و زارۆکە، چاڤێ وی ژ ژنێن کەسی تونەیە، کەسەکی سەربلند، خوەدی نەفسە. ژنا میر چ دکە ناکە، نکارە وی ژ رێ دەرخە، ب وی شابە، رۆژێن خوەش ب هەڤرا دەرباش بکن. چاوا ئەم ژ ناڤەڕۆکا

دەستانێ و گۆتنێن ژنا میر فام دکن. ئەو مێرێ خوە داڤێژە ئالیکی، دخوازە زەمبیل فرۆش کاشی ناڤ جی-نڤینێن خوە بکە. هەرچقاس ئەو ب گۆتنێن خوە یێن شەهوەتی ڤە دنیا زەمبیل فرۆش سەرۆ-بنۆ دکە، دیسا ژی زەمبیل فرۆش ل بەر خوە ددە، نێزیکێ وێ نابە، زارۆکێن خوە دفکرە. دلپاقژی، حەلالی و نامووس، چاوا ئەم دبینن کاکلێ فەلسەفەیا ژیینا زەمبیل فرۆش پێک تینن.

د داوییا دەستانا زەمبیل فرۆش دە چ تێ سەرێ زەمبیل فرۆش و خاتوونێ؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ ئانگۆری شاخێن ڤێ دەستانێ ژ هەڤ گەلەک جودانە:

أ. دەما خاتوون پەی زەمبیل فرۆش دکەڤە دچە مالا وی، چاوا ئەم دبینن خاتوون ژنا زەمبیل فرۆش دخاپینە، دکەڤە ناڤ جیهێ مێرێ وێ، لەمپێ ڤەدمرینە، زەمبیل فرۆش دەما تێ دکەڤە ناڤ جیهێ خوە وەکی رازێ. خاتوون ژ بیر دکە خرخالێ لنگێ خوە دەرخە، زەمبیل فرۆش وێ چاخێ فام دکە کو ئەو نە ژنا وی یە، ئەو خاتوونە، زەمبیل فرۆش دبە تەیرەکی ژ کولەکێ رە دفرە دچە. خاتوون هەفت سال ل پەی وی دگەرە، ل سەرێ چییاکی راستی شۆپا وی تێ، دبنە خووشک و برا ، پشتی چەندەکی، خاتوون دمرە[٢٩].

ب. ل سەر کانیێکێ راستی هەڤ تێن، خاتوون دخوازە زەمبیل فرۆش راموسە، دەما خاتوون زمانێ خوە دخە دەڤێ زەمبیل فرۆش هەردو ژی دمرن[٣٠].

ج. ئاگر دەڤێ خاتوونێ دەردکەڤە، هەردو ژی دشەوتن[٣١].

چ. دچن جەننەتێ، دگهێژن مرازێ خوە[٣٢].

د. میر دەما پێ دحەسە وەکی ژنا وی چوویە ل بال زەمبیل فرۆش، لێدخە



زەمبیل فرۆش دکوژە[٣٣].

ی. زەمبیل فرۆش خوە ژ قەسرێ دە داڤێژە پەرچە-پەرچە دبە[٣٤].

ف. دەما میر دخوازە زەمبیل فرۆش بکوژە، خاتوون دکەڤە ناڤبەرێ، کێرێ ژ دەستێ میر دگرە، زکێ میر رە دکە، ئەو تێ کوشتن. پاشێ خاتوون، زەمبیل فرۆش و ژن-زارێ وی ب تەڤایی دچن، جیهەکی وسان دەنگێ ئاغا و میران ل ور نایێ[٣٥].

گ. ژنا زەمبیل فرۆش و خاتوون دبنە هێوییێن هەڤ، وەک ژنا مەزن و ژنا پچووک ب هەڤرە دژین[٣٦].

ه. زەمبیل فرۆش و خاتوون د ناڤ خوە دە پەیمانەک گرێ ددن وەکی دەست ژ پێسیرا هەڤ بەردن. پاشێ زەمبیل فرۆش ژ بەر داخوازییا باڤێ،، دچە باژارێ دییاربەکرێ دبە میر[٣٧]. ئەڤ شاخا داوین، نە شاخەکە فۆلکلۆریکە، وەک شاخەکە ئەدەبی ژ ئالییێ مراد-خانێ بەیازیدی دە هاتییە نڤیسین.

چاوا تێ دیتن هەتا مرنێ، ل دنیا مایین ژی خاتوون ل پەی زەمبیل فرۆش دکەڤە، پێسیرا وی بەرنادە. دچەند شاخێن دەستانێ دە چاوا تێ خویان، زەمبیل فرۆش هەرچقاس ژ بەر خاتوونێ درەڤە ژی، وسان تێ خویانێ ب کێمانی دبن خووشک-برا. ژ ئالییێ دن دەما ئەم زۆردەستییا مێرێ خاتوونێ ددن بەر چاڤان، ئەم دبینن کو هەڤکاریک و دۆستانەتیک د ناڤبەرا زەمبیل فرۆش و خاتوونێ دە ل دژی میر پەیدا دبە، زەمبیل فرۆش و خاتوونێ نێزیکی هەڤ دکە، ژ ئالییێ دن ژ بەر خزانی و بەلەنگازییێ، ژنا زەمبیل فرۆش ژی، ل دژی خاتوونێ ستووخارە. ئەڤ یەکا ژی وەک فاکتۆرەکێ، پێوەندییێن زەمبیل فرۆش، ژنا وی و خاتوونێ ژ دژمنتایێ دپارێزە و وان دخالەکێ دە د گهینە هەڤ، دژایەتییا ڤان

هەرسێ کەسان کێمتر دکە. بێگومان هەموو ئەڤ باوەرییێن مەسازا دەستانێ ییێن ل سەر حەلالییێ و دلپاقژییێ ئاڤا دبن، ناهەژینە، ژ بەر کو د دەستانێ دە ئەڤ مۆتیڤان گەلەک خورتن. لێ بەلێ هەڤباندوورییا بوویەران بڤێ-نەڤێ چەند دژوارییان ژ بۆ زەمبیل فرۆش پەیدا دکە وەک هەبوونا دو ژنان و نەوەکهەڤ دیتنا خاتوون و مێرێ وێ ... ل دژی مێرێ خاتوونێ موخالەفەتەک پەیدا دبە، وێ چاخێ خاتوون وەک دژمنەکە یەکەمین نایێ حەسبین. د هەردو شاخێن داوین دە چاوا ئەم دبینن زەمبیل فرۆش ژی ئێدی هاتییە گوهارتن.

دەستانا زەمبیل فرۆش ژ ئالیکی دە دەستانا ئوسف و زەلێخە تینا بیرا مرۆڤان، خاتوونا کو ناڤێ وێ د دەستانا زەمبیل فرۆش دە دەرباس دبە گەلەکی ل زەلێخێ چوویە، درووڤێ وێ لێ دکەڤە، وەک هەڤن. زەلێخە ژی وەک خاتوونێ ژنا میرەکی یە، میرێ مسرێ. دەما ئوسف کورێ ئاقووب پێخەمبەر دبن مسرێ دلێ زەلێخێ گەلەک دکەڤە ئوسف. د شاخێن ئوسف و زەلێخێ ییێن فۆلکلۆری دە، چاوا ئەم دبینن کو دەما زەلێخە، ئوسف ژ خوە رە دکرە، دبە، ئوسف رییا رەڤێ دگرە، لێ بەلێ ژ دەستێ ڤێ ژنکێ خەلاس نابە[٣٨]. زەلێخە تینە ڤێ جارێ ئوسف شکیاتی مێرێ خوە دکە، مێر ژی تینە وی دکە زیندانێ. ئەڤ دەستانا د ناڤ کوردان دە گەلەک بەلاڤ بوویە، گەلەک شاخێن وێ ییێن ئەدەبی و فۆلکلۆریک هەنە.

دەستانەکە کو د ناڤەرۆکا وێ دە بابەتا نامووسێ جیهەکی بنگەهین دگرە. دەستانا مەم و عەیشێ یە. کورەکی پیرەژنەکێ هەیە، ناڤێ وی مەمێ یە، دییا وی کورێ خوە دزەوجینە، ناڤێ بووکا وێ ژی عەیشێ یە. پشتی دەمەکێ مەمێ دبنە لەشکەرییێ، هەفت سالان ل لەشکەریێ دمینە. چاڤێ ڤێ داییکێ تمێ ل رێ یە، ل بووکا خوە خوەیی دەردکەڤە. ژ بەر کو



ب سالان ئەڤ مالا بێمێرە، بەرپرسیارییا مەزن دکەڤە ل ستوویێ ڤێ پیرەژنێ، ئەو بەرمالا کورێ خوە دمینە، جیهێ وی دگرە. پشتی ڤێ لەشکەرەییا دوورودرێژ، ئێدی چاڤێ وێ ل رێنێرینیێ دقەرمە، رۆژەکێ دەستوورا هەمێ دەردکەڤە، نیڤێ شەڤێ لێدخە تێ مالا خوە، ئەو و دەرگستییا خوە دکەڤنە ناڤ نڤینان، ئەو دییا خوە هشیار ناکە. دییا وی مێزە دکە، د ئۆدا ئەیشێ دە دەنگێ مێران تێ، دنیا ڤێ داییکێ تەلهەڤ دبە، نزانە کو کورێ وێ یە، لەشکەرییێ هاتییە. یەکتەن. سەرۆ-بنۆ دبە، ب نەزانی لێ دخە کورێ خوە دکوژە[٣٩].

هەم د دەستانێن زەمبیل فرۆش و هەم ژی د دەستانا مەم و عەیشێ دە هەر چقاس بوویەرێن کوشتن و مرنێ پەیدا دبن، لێ بەلێ ژ بۆ ناموسا خوە بپارێزن، یەک ژنا خوە دفکرە، یان دن ژی کورێ خوە دفکرە، ناخوازن ناڤێ وان خراب دەرکەڤە، مرنێ ژ ڤێ یەکێ چێتر دبینن. هەردو دەستان ژی، ل سەر هیم-بنگەهێن نامووسێ ئاڤا دبن.

د سالێن کەڤن دە ژ بەر درێژبوونا لەشکەرییێ، چاوا ئەم دبینن ئەڤ سالێن درێژ بوونە سەدەمێن پارچە بوونا گەلەک مالباتان، ژن-مێر، کەچ-خۆرتێن نووە زەوجی ب سالان ژ هەڤ دوورمانە. هەرچقاس داییکا مەمێ کورێ خوە ژ بیر نەکر بە ژی، ئەڤ داییکا ب سالان هێڤییا هاتنا کورێ خوە مایە، ژ ئالیکی دە کەر-گێش بوویە، مرۆڤ دکارە بێژە وەکی ئەو ژ بیر کریە، هاتنا کورێ وێ ژ بۆ بوویە موجیزەکێ، ئەڤ موجیزە چاوا ئەم دبینن ل بال ڤێ پێرەژنێ نەباوەرییەک پەیدا کرییە، وێ باوەر نەکرییە رۆژەکێ کورێ وێ و بووکا وێ ببن یەک، تێکەڤن ناڤ نڤینان، د هشێ وێ دە هەرتم ئیمازا بووکەکە تەنێمایی جیوار بوویە، ئەو تابلۆیا نووە ژ هشێ خوە رە دەرباس نەکرییە.

## نەفرەتا کۆنترا-میلیتەر

چاوا ئەم دبینن گەلەک مالباتێن کورد ژ بەر لەشکەریێ تمێ رۆژێن ترش و تال دەرباس کرنە. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی د فۆلکلۆرا کوردی دە ئەلەمەنت و مۆتیفێن کونترا، میلیتەر جیهەکی بنگەهین دگرن. ل وەلاتێن بیانی، ل وەلاتێن دوور، کرنا لەشکەرییێ ژ بۆ هەر کوردەکی وەک جەزاکی گران هاتییە دیتن.

دەستانەکە کو تێ دە ل دژی هێزێن میلیتەر پرۆتەستۆکە مەزن هەیە، دەستانا مەنشا عەلییێ سێلم - ئاغایە. کیکی پاشا، پاشایێ دەولەتێ دخوازە کەچەکە چاردەهـ سالی (مەنشێ) ژ خوە رە وەکی ژن بینە، لێ بەلێ دەما کەچک و هەفت برایێ وێ ڤێ یەکێ قەبوول ناکن، ئەڤ پاشا هەفت برایێ مەنشێ ب داریێ زۆرێ دخە گرتیگەها دییاربەکرێ. هەتا مەنشێ نەدنە وی، ئەو بریار دگرە کو ڤان هەفت برایان د گرتیگەهێ دە گرتی بهێلە، وەک لیستکەکێ. ئەنتریکا و سانتاژەکێ گرتنا ڤان هەفت بران ل دژی مەنشێ ب کار تینە. د دەستانێ دە چاوا ئەم دبینن مەنشێ ستوویێ خوە ل دژی ڤێ زۆردەستییێ خارناکە، ژ بۆ برایێن خوە ئازاد بکە، ئەو دکەڤە سەر رێ دچە خەلاسییا وان. د داوییێ دە سەردکەڤە، برایێن ڤێ کەچا مەردینی تێن بەردانێ(٤٠).

سەرپێهاتییا مەنشێ، سەرپێهاتییا سالحۆ تینە بیرا مرۆڤان، چاوا مەنشێ دخوازە هەفت برایێن خوە ژ زیندانێ دەرخە، ئازاد بکە، نووریێ ژی دخوازە دلکەتییێ خوە سالحۆ خەلاس بکە، دلکەتییێ وێ ژی وەک هەفت



برایێن مەنشێ د گرتیگەها دییاربەکرێ دە هاتییە گرتن. سالح هەژدەهـ سالی یە، سەد سال جەزا دانێ. نووریێ، گەلەک بەرخوە ددە وەکی سالحێ وێ بێ بەردانێ، گازی رەئیسێ جومهورییەتی کەمال پاشا و پێخەمبەران دکە، ژ بەر دەرگەهێ کەلا دییاربەکرێ دوور ناکەڤە، هەتا کو سالح بێ بەردانێ:

نووریێ دبێ: سالحۆ بزمامۆ، بەژنا من زراڤە،<br>
تێلەک ژ تێلا ڤێ رحانێ،<br>
هێشین دکە سەر خۆپانا دییاربەکر،<br>
پێشبەری حەپسخانێ.<br>
........(٤١).

ژنێن کورد شەرێ ل دژی هێزێن دەولەتێ و هەڤالبەندێن دەولەتێ دە تمێ ل بال مێرێن خوە، لاوێن خوە، جیە گرتنە، ب مێران ڤە تەڤایی ل دژی نەهەقی، زۆردەستی و ل دژی ئێریشێن دەولەتێ شەرکرنە، د سەرپێهاتییا بشارێ چەتۆ دە، گۆزێ، چاوا ئەم دبینن ل بال کورێ خوە جیە دگرە، ل دژی بشارێ چەتۆ دەردکەڤە، ژ وان چەند کەسان دکوژن. وەک تێ زانین بشارێ چەتۆ هێزێن دەولەتێ یێن لەشکەری هلددە بال خوە ل دژی عەمێ گۆزێ شەر دکە. هەڤکارییا بشارێ چەتۆ ب دەولەتێ رە وسان پێشتا دچە، ئەو دبە ئێریشکارەکی ناڤدار. عەمێ گۆزێ ب مێرخاسی و ب دلسۆزییا خوەڤە تێ ناس کر. ب کورتی ئەڤ سەرپێهاتییا وەک دەستانەکێ بوویە نیشانا شەرێ پاکی-نەپاکییێ، هەقی-نەهەقییێ، قەنجی-خرابییێ. گۆزێ، د ڤی شەری دە تمێ قەنجییێ دخوازە. دەما گۆزێ ل دژی هێزێن دەولەتێ کورێ خوە دپارێزە، ئەو، نەفەر، لەشکەر و سەرۆکێن وان یێن زابت ژ هەڤ جودا دکە، گونێ وێ ب ڤان نەفەران تێ، پاشێ شیرەتان کورێ خوە دکە و گازی وی دکە، «چاڤێ مالییا وان ل رییا وانە (٤٢). د د جیهەکی ماین دە ژی ئاوا دبێژە :«دە نەکوژە نەفەرا، نەفەر کورێ خەلقێ نە، نانخۆرێ دەولەتێ نە»(٤٣).

ئەڤ مرۆڤحەزییا گۆزێ، وەک دلپاقژیکێ دبە کاکلێ دنێناسیکە گەلەک پێشکەتی.

دەستانا کو تێ دە زۆردەستی، هۆڤیتی و لێدانێن ل سەر ژنێ زێتر دبن، دەستانا مەهر و وەفایە. هێزێن لەشکەری د ڤێ دەستانێ دە ب دارێ زۆری شاخسییەتا وێ کەچا ب ناڤێ وەفا پێپەس دکن. ڤێ کەچکێ وەک دیل (هێسیر) دگرن. ئانگۆری دەستانێ، کورەکی پادیشاهێ موخرزەمێن هەبوویە، ناڤێ وی مەهر بوویە، دلێ وی دکەڤە کەچا بەردەستییێ پاتیشاه، ناڤێ وێ وەفا بوویە. ئەو ب هەڤرە دچن دبستانێ، د ناڤبەرا وان دە ئەڤینا دل رۆژ ب رۆژ زێتر دبە. رۆژەکێ پادیشاه کورێ خوە مەهر دکە سەر لەشکەر، وی دشینە حیجازێ وەکی تەڤی شەر بە. مەهر و وەفا ب ئالیکارییا مامۆستەیێ خوە ب هەڤرا نامان دنڤیسن، خەبەران ژ هەڤ دگرن. رۆژەکە وەفا خەونەکێ دبینە، وەکی مەهر د شەڕ دە هاتییە بریندار کرن. دەما ئەو هشیار دبە، تڤدارەکێ خوە دکە، دچە هەوارییا دلکەتییێ خوە. ئەڤ کەچا دچە دەردکەڤە حزوورا مەلیکشاه، مەلیکشاه ڤێ کەچکێ بەرنادە، ب خوە رە دبە، دکە بووکا خوە. دوێ دەمێ مەهر ژی، ژ لەشکەرییێ ڤەدگەڕە تێ مال. پاشێ پێ دحەسە کو دلکەتییا وی چوویە هەوارییا وی. مەهر جارەکە دن ڤەدگەڕە، پەی وەفایێ دکەڤە. دچە مالا وێ پیرەژنا کو وەفایێ خەبەر ل بال هیشتبوو، پاشێ فێر دبە کو، مەلیکشاه دلکەتییا وی وەفا ژ کورێ خوە رە برییە. مەهر دەما دچە باژارێ مەلیکشاه، مێزە دکە کو دیلان–دەواتا وەفایێ تێ کرن. ئەو دلکەتییا خوە ژ ناڤ گۆڤەندێ درەڤینە. مرۆڤێن مەلیکشاه پەی وان دکەڤن. د رێ دە وان هەردویان ژی ددن بەر گوللان، دکوژن.

دەستانا کو، جەنگەواری، عەگیتی، وەلاتپارێزی و مێرخاسییا ژنێن



کورد ب ڤەکری پێشکێش دکە، دەستانا دم دمە. ئەڤ دەستانا ب ناڤەکی مایین دەستانا خانێ لەپزێرین ئان ژی دەستانا خانێ چەنگزێڕین تێ ناسین. د دەستانێ دە ل دژی ئۆردییێن فارس د ناڤ کەلاکێ دە بەرخوەدانا گەلێ کورد تێ زمێن. ئەڤ بوویەرا وەک بوویەرەکە دیرۆکی ل دۆربەرێ کەلا دم دمێ د سالا ١٦٠٨–١٦١٠ ئان دە قەومییە. کوردان ل دژی هێزێن شاه عەباس شەڕ کرنە. دەما ئۆردییێن فارس ئێریشێ دبنە ل سەر ڤێ کەلێ، کورد د هوندرێ کەلێ دە دجڤن، ب مەهان ل بەرخوە ددن، تەسلیم نابن، هەتا کو کۆکا وان تێ. د گەلەک شاخێن ڤێ دەستانێ دە ئەم راستی بەرخوەدان و تەکۆشینا ژنێن کورد ژی تێن. ئەو دڤێ بەرخوەدانێ دە ب ئاکتیفی جیه دگرن. ب تایبەتی د داوییا دەستانێ دە دییا خانێ لەپژێڕین، ژن، بووکێن وی و ژنێن مایین ب جەنگەوارییا خوە ڤە چاڤێ دژمن گەلەک دترسینن. ژ بۆ کو ئەو ب جان نەکەڤن دەستێ هێزێن نەیار، دەما دژمن دخوازە بکەڤە کەلێ، ئەو ب دەستێ خوە ئێگر بەری خوە ددن، خوە دشەوتینن. د شاخەکە ڤێ دەستانێ دە، ژنا خان ب قیرینان ڤە گەل هشیار دکە و دبە پێشەنگ. د شاخەکە مایین دە ڤێ جارێ دییا خان ل مرۆڤان شیرەتان دکە، ناڤێ وێ گوهەرخانم بوویە، ئەو نیشان ددە کو مرن ژ تەسلیمبوونێ چێترە[٤٤]. ئانگۆری گۆتنێن گوهەرخانمێ هەرکەس تڤدارەکێ خوە دکە و خوە ئامادە دکە. دیسا د ڤێ شاخێ دە دەما ژنا خان مێزە دکە وەکی دژمن هەول ددە، بکەڤە هوندرێ کەلێ، ئەو ئێگر بەردده جەبرخانا کەلێ، کەلا ژنێشکێڤا دتەقە، د ناڤ دومانێ دە دمینە، ناڤێ وێ ئانگۆری ڤێ شاخێ دەستانێ ئاسیمەخانم بوویە[٤٥]. ژ ئالییێ دن بوویەرا کەلا دمدمێ دەرهەقا دیرۆکا تەڤگەرا ژنێن کوردستانێ دە ژی بوویەرەکە گرنگە. ژ بەر کو ئەڤ بوویەرا هەم وەک بەرهەمەکە فۆلکلۆریک، هەم ژی وەک

بوویەرەکە دیرۆکی تێ زانین.

جڤاتا کورد تمێ ژنێن جەنگەوەر، بێترس و مێرخاس ڤە سەربلند بوویە، ئەو هاتنە پەسناندن د دەستـانا رۆستـەمێ زال دە، ئەم راستی چەند ژنێن وسان هێزدار تێن، ژ ڤان ژنان یەک ژی ئەو کەچا ب ناڤێ روودەڤەیە، تو پەلەوانا پێ نکار بوو. ئەو و باڤێ روستـەم گـولاش دگـرن، ئەو زۆرا زال دبە، پاشێ زال ب وێ رە دزەوجـە. پاشێ روودەڤـە دوەلدە، روسـتـەم ژێ دبە، د شاخەکە مایین دە، دەما روستەمێ زال دنێرە، کەچا وی ل پێشبەری خولامێ وی گورگێن پۆزێ خوە خاردکە، دبێـژە ئەزێ تە بکوژم. کـەچا وی کنجێ پەلەوانا خوە دکە، دچە دکـەڤە شکەفـتێ سـەرێ دێوەکی ژێ دکـە، ئەوی دێوێ کـو بەرێ روسـتـەم ب خـوە جەسـارەت نەکـربیـە سـەرێ وی ژێ بکە. پشـتـی ڤێ بێـترسـییـا کـەچا خـوە، ئەو دبێژە «حەیفـا ڤێ قـیـزێ ئەز بکوژم»، پاشێ دەست ژ کوشـتنا کەچا خوە بەرددە. د دەسـتـانا روسـتـەمێ زال دە، ژن بووک و کەچ هەرتم ب دەستێ روستەم تێن رزگارکرن، دەما ئەو دکەڤن تەنگاسییێ، جارا پێشین ئەو خوە داڤێژن ل بەر بەختێ روستەم. ژ بەر کو ئەو پەلەوانە، کەس نکارە نێزیکی مالا وی ببە. ئەو دبە پارێزگارێ ژنێن بندەست، گەلەک جاران وان خەلاس دکە. دەما دێوێ فرندە ژنا یەکی دەرڤـینە، خـارزییێ وی بێـژەنگ، ڤێ ژنێ ژ دەست دێو خـەلاس دکـە، تەسلیمی مـێرێ وێ دکـە. د شاخـەکە مـایین دە، روسـتـەمێ زال دبە سـەر دەواتییێ کورێ سەلمیبانی سند، تڤدارەکێ خوە دکە، دچە دەواتێ، خەبەر تێ کـو دێوێ حـەفـتـسـەری (تەنێ سـەریکی وی هەبوویە، سـەرێ دن ب کنجـان ڤـە چێکرنە) بووک رەڤـاندییـە، ژ خـوە رە برییـە. ناڤێ بووکێ ژی شمکزێر بوویە. ئەو لێدخە دێوێ هەفتسەری دکوژە. بووکێ هلددە، ڤەدگەڕە تێ دگهێژە جیهێ دەواتێ. د شاخـەکە مـایین، خۆرتەک کەچەکێ درەڤینە،



تینە مالا روستەمێ زال. پ زمامێن کەچکێ داڤێژنە ل سەر مالا روستەم. روستەم ب وان رە دکەڤە شەڕ، لێ بەلێ روستەم زۆرا وان دبە، ژ وان گەلەک شوندا درەڤن. پاشێ روستەمێ زال، خۆرت و کەچکێ د مالا خوە دە خوەیی دکە. د گەلەک شاخێن دەستانا رۆستەمێ زال دە دەما روستەم پەی دژمنێ خوە دکەڤە ئان ژی دخوازە یەکی/ یەکێ خەلاس بکە، جارا پێشین ئەو دچە دبە مێڤانێ پیرەژنەکێ، ب وان دشێورە، گۆتنێن وان ژ خوە رە دکە شیرەت. ئەو، گەلەکی ئالیکاری و پشتگرتییا روستەمێ زال دکن[٤٦].

## وەلاتێ شاهییێ: ئەلدۆرادۆ

چاوا تێ خویان هەموو ئەڤ دەستانێن کوردی ب مرن کوشتن ڤە دقەدن، هەم دەسـتـانێن ئەڤـینێ یێن رۆمـانتـیک، هەم دەسـتـانێن نامـووس-حەلالییێ، هەم ژی دەستانێن جەنگەوارییێ ل سەر ڤان پێوەندییێن ترش -تال و بوویەرێن ترادەژیک ئاڤا دبن. ژنێن کورد ژی چاوا ئەم دبینن ژ ڤان بوویەران نەسیبێ دستینن و زوو-زوو ناگهێژن مرازێ خوە. ئەڤینا ناڤبەرا دو کەسان ژ بەر گەلەک دژوارییان ناچە سەری و سەرناکەڤە. دەستانا کو د ناڤەرۆکا وێ دە مرۆڤ راستی رێچا مرن کوشتن و مال وێرانکرنێ نایێ، دەسـتانا سێـڤا حەجی یە. د ڤێ دەسـتـانێ دە دلێ کـەسی ژ بۆ تو کـەسی نامینە، کێم - زێدە هەرکەس دلشایە. وارێن کو بوویەرێن دەستانێ تێ دە دەرباس دبن وەک جـەننەتەکـە دەرەوین-وەلاتێ خـوەشـیێ، شـاهیـیێ (ئەلدۆرادۆ) تمێ مـرۆڤ ب مرازێ خوە شا دبن، پشـتی سەفـەرەکە دوور-درێژ ب زەحمەت، باڤ سێڤا حەجی ددە میر مەحموودێ جندی، ئەو، دەما دلکەتییا خوە سێـڤا حـەجی دبە وەلاتێ خـوە، د رێ دە راستی شڤـانەکی

تێن، ئەو شڤان شڤانێ مالا باڤێ سێڤا حەجی بوویە، هەفت سال شڤانتییا وان کرییە، ئانگۆری گۆتنێن سێڤا حەجی باڤێ وێ بڕیار گرتبوو وەکی پشتی سالەکێ کەچا خوە بدە ڤی شڤانی. بۆ ڤێ یەکێ ژی گونێ سێڤا حەجی گەلەکی ل ڤی شڤانی تێ، دلێ وی ژی د سێڤا حەجی دە هەبوویە. میر مەحموودێ جندی ژ بەر زانەبوونا ئێش و ژانا دلان، دبێژە دەرگستییا خوە وەکی رامووسانەکێ بدە شڤان و خاترێ خوە ژێ بخوازە، دەمەک بە ژی سێڤا حەجی و شڤان هەڤ رادمووسن. چەند سال دەرباس دبن، ژ سێڤا حەجی رە کەچەک دبە، ناڤێ وێ داتینن سێڤا سێڤێ، ئەو کەچ مەزن دبە، دبە کەچەکە خاما. ئەڤ شڤانێ کو بووبوو ئەڤینداری سێڤا حەجی، هێ سێڤا حەجی ژ بیر نەکر بوو. رۆژەکێ دچە سێڤا هەجی برەڤینە. وێ چاخێ خەبەرێ هلددە کو کەچەکە وێ بوویە. ڤێ جارێ تینن ڤێ کەچکێ سێڤا سێڤێ ددنە ڤی شڤانی، ئەو ژی دگهێژە مرازێ خوە. د شاخەکە مایین یا ڤێ دەستانێ دە چاوا ئەم دبینن، میر مەحموودێ جندی ب گولچیچەکا دلان رە ژی دزەوجە، وێ ژی ب خوە رە دبە. گولچیچەکا دلان ژ دەر دیتنا قەیتانا هەمەدانێ (ژ بۆ چاڤێ باڤێ سێڤا حەجی ببینە، وی نکاربوویا بدیتا)، کەچەکێ ژ باڤێ سێڤا حەجی رە تینە. چاوا تێ خویان هەموو کەسێن کو د ڤێ دەستانێ دە هەنە، هەموو ژی دگهێژن مرازێ خوە، دلشا دبن، دلێ تو کەسی ژ کەسی نامینە، باڤێ سێڤا حەجی، سێڤا حەجی، کەچا وێ سێڤا سێڤێ، میر مەحموودێ جندی، شڤان، گولچیچەکا دلان هەموو بەختەوارن، دەستان ب تەحرەکی دلشا دقەدە.(٤٧)

دەستانەکە مایین کو ب شاهییێ ڤە دقەدە ژی، دەستانا بەهرام و گولەندامە. دەما بەهرام ژ راو و نێچیرێ تێ، د رێ دە راستی دەورێشەکی تێ، ناڤێ وی شاه مەنسوورە، ئەو پادیشاهێ حەلەبێ بوویە. بەهرام مێزە



دکە، رەوشا مەنسوور شاه قەت نەباشە. د بەر دلێ وی دە تێ و سەدەمێن بەدحالییا وی ژێ دپرسە، ئەو دبێژە دەردێ دلایە. پشتی ڤان گۆتنان ئەو ژ بەریکا خوە دو سوورەتان دەردخە یەک گولەندامە، یەک ژی سوورەتێ فریدایێ بوویە. گولەندام و فریدا پزمانێ هەڤ بوونە و گەلەک بەدەو بوونە، ژ هەر دەرێ کەس دهاتنە دیتنا وان. دلێ مەنسوور د فریدایێ دە هەبوویە. دەما ئەو ڤان سوورەتان نیشانی بەهرام ددە، بەهرام وێ دبینە هشێ سەرێ وی دچە و دبە ئەڤینداری گولەندامێ. ب ڤی تەحری بەهرام و مەنسوور شاه دبنە هەڤال، پەی رێچا گولەندام و فریدایێ دکەڤن. پشتی رێویتیکە درێژ و زەحمەتییێن مەزن، ئەو دگهێژن مرازی خوە، گولەندامێ ددنە بەهرام، ژ بەر کو گەلەک مێرخاس بوویە، گۆتنێن وی تمێ دهاتن قەبوول کرن، ل سەر داخوازییا بەهرام، فریدایێ ژی ددنە مەنسوور شاه، چل رۆژان و چل شەڤان دیلان و شاهییا دکن(٤٨).

# چاڤکانی


١- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیس، خەباتەکە نەچاپبوویی). قەناتێ کوردۆ، ئەڤ بەرەڤۆکا دەستانێن کوردی بەری مرنا خوە ئامادە کرییە؛ د ناڤ ڤێ دەستنڤیسێ دە هەفت دەستانان جیە گرتییە، ژ ئالییێ دن بۆ ڤێ خەباتێ پێشگۆتنەک ژی نڤیسییە. د ناڤ ڤان دەستانان دە چار دەستان ژ زاراڤێ سۆرانی وەرگەڕاندایە زاراڤێ کورمانجی. ئەڤ هەر چار دەستان جارا پێشین، ژ ئالییێ قادری فەتتاحی قازی دە ل ئیرانێ د ناڤ وەشانێن یونیڤەرستیا تەبریزێ دە هاتنە وەشاندن، وەک فەرخ و ئاستی، شۆڕ مەحموود و مەرزنگان، مەهر و وەفا، بەهرام و گولەندام. قەناتێ کوردۆ سێ دەستانێن کو نەوەرگەڕن، وەک عەلی شێر، زەمبیل فرۆش، هەسپێ رەش ژی ئانییە د ناڤ ڤێ بەرەڤۆکا ب ناڤێ بەیتێد کوردی دە جیوار کرییە. ئانگۆری هەردەستانەکێ هەژمارا رووپەلان دایێ، وەک پرتووک هەژمارا نەدانە رووپەلان.

٢- ئۆسکار مان، دیەموندارت دەر موکری کوردان I–II ، بەرلین، ١٩٠٦-١٩٠٩ . ئۆسکارمان د جلدێ یەکەمین دە چەند دەستانێن کو د ناڤ کوردێن ئیرانێ دە بەلاڤ بوونە، جڤاندییە، ب کوردی، ب تیپێن لاتینی چاپ کرییە. د جلدێ دووەمین دە ژی، ئالمانییا ڤان دەستانان جیە گرتییە. ٣٠٢-٤٧٨ رووپەل. ئەڤ خەباتا، د دەما خوە دە خەباتەکە هەرە فرە و پێشینە کو ل سەر دەستانێن کوردی هاتییە ئامادەکرن.

٣- هەتا نها چەند شاخێن لەیلاو مەجنوونێ یێن فۆلکلۆریک هاتنە بەرەڤ کرن. حەجییێ جندی، کوردسکی ئەبچە سکی پەسن. سکازکی (بەیت-سەرهاتییێن کوردی یێن ئەپسکی)، مۆسکۆڤا ١٩٦٢ ، رووپەل ١٦٣-١٦٩ (د دڤێ شاخێ دە ناڤێ دەستانێ لەیلا و مەجنوون دەرباس دبە). ئۆردیخانێ جەلیل، جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردان، ئەریڤان، ١٩٨٢ ، رووپەل ١٣٢-١٣٨ (د ڤێ شاخێ دە ناڤێ دەستانێ لەیلا و مەجنوون دەرباس دبە). ژ ئالییێ دن چەند شاخێن ڤێ دەستانێ یێن ئەدەبی ژی هاتنە نڤیسین. ژ ڤان شاخان یەک ژ ئالییێ حاریسێ بیتلیسی، د سالا ١٧٥٨ ئان دە هاتییە نڤیسین. ئەڤ شاخا پاشێ د سالا ١٩٦٥ ئان ژ ئالییێ م. ب. رودەنکو ژ نووە ڤە ل مۆسکۆڤا چاپ بوویە. پاشێ شاخەکە ڤێ دەستانێ یا ئەدەبی ب فرەهی ژ ئالییێ شێخ محەمەد جان دە، ل دۆرا سالا ١٨٨٤ ، ئان دە هاتییە نڤیسین و ب تیپێن لاتینی ژ نووە ڤە ژ ئالییێ زەینەلعابدین زنار دە هاتییە چاپ کرن. شێخ محەمەد جان، لەیل و مەجنوون، ستۆکهۆلم، ١٩٩٣ .

٤- م. ب. رودەنکۆ، Literaturnaya i Folklornie Versii Kurdskoy “ Yusu-fi Zelêxe“ (شاخێن پۆەما کوردی ئوسف و زەلێخە یێن ئەدەبی و فۆلکلۆریک) مۆسکۆڤا، ١٩٨٦ ، رودەنکۆ، د ڤێ لێکۆلینا خوە دە، شاخەکە ڤێ دەستانێ یا کەڤن کو ژ ئالییێ سەلیم سلەیمان دە هاتییە نڤیسین ب کوردی و رووسیا وێ ڤە تەڤایی چاپ کرییە. و چەند شاخێن فۆلکلۆریک ژی پێڤا کرییە.

٥- حەجییێ جندی، شاخێن ئەپۆسا «روستەمێ زالە» کوردی، ئەریڤان، ١٩٧٧ ، حەجییێ جندی ، د ڤێ بەرەڤۆکێ دە (٢٤) شاخێن دەستانا روستەمێ زال وەشاندییە.

٦- دەستانا فەرهات و شرین هەرچقاس د ناڤ کوردان دە زێدە بەلاڤ نەبوویە ژی، وەرگەڕێن ڤێ دەستانێ یێن کوردی هەنە، بنێرە بەرهەم، هەژمارا (٢)، ١٩٩٢ (ئەحمەد شەریفی، حەکیم شێخ ئەلییاس نیزامییێ کوردی). ئەحمەد شەریفی، د ڤێ لێکۆلینا خوە دە چاوا دییار دکە، نیزامی - نڤیسکارێ خوسرەو و شرین ژ ئالییێ دێ دە کورد بوویە. چاوا ئەم ژ شەرەفنامێ فێردبن مێرخاسێ ڤێ دەستانێ فەرهات ژی کورد بوویە، ژ کوردێن کەلهور بوویە، شەرەفنامە، ئەستەمبول، ١٩٧١ ، رووپەل ٢٣ .

٧- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیسا وەرگەڕا شێخ فەرخ و خاتوون ئاستی، ژ ٣٠ رووپەلان پێک تێ).

٨- جگەرخوین، فۆلکلۆرا کوردی، ستۆکهۆلم، ١٩٨٨، رووپەل ١١٨ .

٩- م. ئارارات. دەنگبێژ کەرەم، رۆژا نوو، هەژمارا ٨ ، ١٩٨٥ .

١٠- دەستانا مەمێ ئالان، ئەستەمبۆل ، ١٩٧٨ ، رووپەل ١١٧ .

١١- ئانگۆری چەند شاخێن مەمێ ئالان و زینا زێدان، مەم ژ یەمەنێ تێ ژ بۆ دیتنییا زینێ، بنێرە ئۆسکار مان، ١٩٠٩ ، رووپەل ٤٢ . ئانگۆری ڤێ شاخێ، مەم، کورێ پادیشاهێ یەمەنێ ئیبراهیم بوویە.

١٢-ئۆسکارمان، ناڤێ وێ وەکی خوە بێت نڤیسین رووپەل ١٣٥-١٦٥

12- Oskarmann, Die mundart der muki Kurden II , rüp. 135-165.

١٣- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیسا وەرگەڕا دەستانا شۆر مەحموود و مەرزنگانێ ژ ٢٧ رووپەلان پێک تێ).

١٤- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا، I، رووپەل ١٤٩ .

١٥- حەجییێ جندی، بەیت - سەرهاتییێد کوردی یێن ئەپیکی، رووپەل ١٥٣ .

١٦- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا، I، رووپەل ١٧١ .

١٧- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیسا وەرگەرا دەستانا مەهر و وەفا ٢٣ رووپەلان پێک تێ.

١٨- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا، رووپەل ١٤٧ ، ژ دەرشاخێن دەستانا سیایەند و خەجێ یێن فۆلکلۆریک، چەند شاخێن ڤێ دەستانێ یێن ئەدەبی ژی هاتنە وەشاندن. سیابەندۆڤ سەمەند، سیابەند و خەجێ، ئەریڤان، ١٩٥٩ . زەینەلعابدین زنار، سیابەند و خەجێ، ستۆکهۆلم، ١٩٩٣ ، کۆیۆبەرز، سیامەد و خەجا (ب زاراڤێ دملی)، ستۆکهۆلهم ١٩٩٣ .

١٩- حەجییێ جندی، بەیت - سەرهاتییێد کوردی یێن ئەپیکی، رووپەل ١٧١ .

٢٠- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستانا شێخ فەرخ و خاتوون ئاستی رووپەل ٨ .

٢١- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل،سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریڤیێ، ئەریڤان، ١٩٧٧ ، رووپەل ٢٧١ .



٢٢- عەینی بەرهەم، رووپەل ٢٤٩ .

٢٣- ئەحمەد ئاراس، دەستانا کەڕ و کولک، ئەستانبول، ١٩٩٣، رووپ. ٥٤ .

٢٤- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا -I-، رووپەل ١٦٠ (ناڤێ ڤێ قەیتانا هەمەدانێ. د شاخەکە مایین یا ڤێ دەستانێ دە وەک قەیتانا مەموودێ دەرباس دبە، بنێرە، حەجییێ جندی، ١٩٦٢ ، رووپەل ١٥٤ .

٢٥- ئۆسکارمان، ١٩٠٩، رووپەل ١٦٦، ٢٠٥ .

٢٦- عەینی بەرهەم، رووپەل ٤٠٤-٤٢٩ .

٢٧- رۆجەر لەسکۆ، بنەفشا نارین و جەمبەلییێ هاکارێ، هێڤی، هەژمارا (٢)، ١٩٨٤ .

II ve Diyarbakir 28- Muhsine Helimoglu yavuz, Diarbakir Efsaneleri Üzerine Sekiz Bildiri, Ankara, 1990. rüp. 142.

٢٩- ژ. س. موسالییان، زەمبیل فرۆش - کوردسکایا) زەمبیل فرۆش، پۆیەما کوردی و شاخێن وێ یێن فولکلۆریک) مۆسکۆڤا، ١٩٨٣، شاخا I .

٣٠- ژ. س. موسالییان، زەمبیل فرۆش، شاخا II ،

٣١- ژ. س. موسالییان، زەمبیل فرۆش، شاخا IV ،

٣٢- ژ. س. موسالییان، زەمبیل فرۆش، شاخا VI ،

٣٣- ژ. س. موسالییان، زەمبیل فرۆش، شاخا VII ،

٣٤- ژ. س. موسالییان، زەمبیل فرۆش، شاخا IX ،

٣٥- شاخا ئەمینێ عەبدال (د ناڤ پرتووکا موسالییان دە جیە گرتییە).

٣٦- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (ئەڤ دەستنڤیسا شاخا زەمبیل فرۆش یا کو قەناتێ کوردۆ خوە بەرەڤ کرییە ژ ١٦ رووپەلان پێک تێ).

٣٧- ئەڤ شاخا دەستانا زەمبیل فرۆش وەک شاخەکە ئەدەبی هاتییە ئامادەکرن، د ناڤ پرتووکا موسالییان دە جیە گرتییە. ژ ئالییێ مراد خانێ بەیازیدی دە هاتییە نڤیسین. ل سەر ڤێ شاخا دەستانێ لێگەرینەک د کۆڤارا (پالە) دە وەک دو بەشان

هاتیه وەشاندن، بنێرە هەژمارا ٣-٤، ١٩٧٩ .

٣٨- م. ب. رۆدەنکۆ، شاخێن پۆەما کوردی ئوسف و زەلێخە یێن ئەدەبی و فۆلکلۆریک، رووپەل ٢٩٧ .

٣٩- حەجییێ جندی، بەیت و سەرهاتییێد کوردی یێن ئەپیکی، رووپەل ١٣٩-١٤٦ .

٤٠- جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردێن سورییایێ، ئەریڤان، ١٩٨٥، رووپەل ٧٩-٩٥ .

٤١- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقییێ، رووپەل ٢٣٨ .

٤٢- ر. دەنگیر، بەرخوەدانکاری گەردەن ئازادییا عەمێ گۆزێ و دو گوتن ل سەر بشارێ چەتۆ، رەوشەن، هەژمار (٢٥)، ١٩٩٠ .

٤٣- ئۆردیخانێ جەلیل، سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقییێ، رووپەل ٣٠٤ .

٤٤- ئۆردیخانێ جەلیل، «Kurdskiy Geoyiçeskiy Epos “Zlarorûkiy Xan“» (ئەپۆسا کوردی یا مێرخاسییێ (خانی لەپزێرین)، مۆسکۆڤا، ١٩٦٧، رووپەل ٧٤ . د ڤێ بەرەڤۆکێ دە چەند شاخێن دەستانێ هاتنە وەشاندن.

٤٥- عەینی بەرهەم، رووپەل ١١٩ .

٤٦- حەجییێ جندی، شاخێد ئەپۆسا «روستەمێ زالە» کوردی، ئەریڤان ١٩٧٢ .

٤٧- حەجییێ جندی، بەیت- سەرهاتییێد کوردی یێن ئەپیکی، رووپەل ١٥٦ .

٤٨- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیسا وەرگەرا بەهرام و گۆلەندامێ ژ ٥٦ رووپەلان پێک تێ).

## د سترانێن كوردی ده ناڤچەكە ئەرۆتیک: مەمک

د ناڤ سەد سالێن بهوری دا جڤاتا كوردی ب چ چاڤی پرسا ژنان نهێربیه؟ ب ئالیكاریا ماتەریالێن فۆلكلۆرا كوردی مرۆڤ دكاره بەرسیڤا ڤێ پرسێ ژی بده. ژنا كورد هەتا ژ دەستێ وێ هاتییه، یا خوه كرییه، دەما خواستییه، ب دلكەتییێ خوه ره رەڤییه، ب ڤێ یەكێ ڤه مرۆڤ دكاره بێژه هەموو دژواری و تەنگاسییێن ل پێشییا خوه پرۆتەستۆ كرییه، ئەڤ مەتەلۆكا هان ڤێ دلسۆزییا ژنێن كورد گەلەک باش ئەشكەره و ئیسپات دكه: رەڤا ژنێ عەدەتێ دنێ، لێ بەلێ ئەو دۆرگرتنا جڤاكی، ئابۆری و پۆلیتیک تمێ رییێن خەلاسییێ ژ وێ ره گرتنه، چەمبەرا ل دۆر وێ هەرچوویه تەنگ بوویه. ژ ئالییێ دن ژنا كورد تمێ ستوویێ خوه ل هەمبەری ڤان ئێریشان خار نەكرییه. ب تایبەتی ئێریشێن فەئۆدالی، نیڤ-فەۆدالی قەت نەبه ب سایا فۆلكلۆر، ستران، دەستان، گۆتنێن پێشییا و بەرهەمێن مایین هاتنه پرۆتەستۆكرن. ب كورتی ژنان ب كێمانی ژ خوه ره تەختەک ئاڤا كرنه، دەنگ و روومەتا خوه بلند كرنه.

دەما مرۆڤ ناڤەرۆكا سترانێن كوردی راچاڤ دكه، مرۆڤ دبینه كو تەما ئەڤینێ، تەماكه هەره خورته. د ناڤ ڤێ تەما ئەڤینێ ده ژی، مۆتیفا مەمكێن ژنان جیهەكی ب تایبەتی پێک تینه. تو بەشەكه بەدەنا ژنێ وەک مەمكان مۆتیفەكه خورت و رەنگین نینه. د چەند ستران ده ئەم راستی مۆتیفا لێڤان ژی تێن، لێ بەلێ لێڤ وەک مەمكان ئەوقاس نه بالكێشن، د پلانەكه دووەمین ده دمینن و گەلەک جاران ب پەیڤا راموسانێ ڤه



دكەڤنه زكێ هەڤ، گازی هەڤ دكن. هەژمارا ڤان سترانێن كو ل سەر مەمكان شاخ ڤەدانه، د زارگۆتنا كوردی ده دگهێژه دەرەجەكه بلند-كێم-زێده هەر سترانەكه كوردی یا كو ل سەر ئەڤینێ-ڤییانێ هاتییه گۆتن، تێ ده قالا مەمكان تێ كرن. ئەڤ ستران د ناڤ فۆلكلۆرا كوردی ده بنگەهێن ئەدەبییاتەكه ئەرۆتیک پێک تینن. بێگومان نیشانێن پێل و جەرەیانەكه ئەرۆتیک ب تەحرەكی باشترین د سترانێن كوردی ده خوه نیشان دده. د ڤان ستران ده هەموو مۆتیف و نیگارێن دەربارەیی مەمكان ب زمانەكی گەلەک بلند، فۆلكلۆریک و گرانبها ڤه تێن پێشكێش كرن، وەک میسال، كەچ تمێ دخوازه دلكەتییێ خوه وەک «دۆست» ببینه، كەچ وی وەک «مێڤان» ب ناڤ دكه و ئەڤینێ ل سەر هەر تشتی دبینه، مالێ دنیایێ داڤێژه ئالیكی:

ها وەر دەلال
ئەمینۆ كورۆ، تو شەڤكێ
وەره مالا باڤێ من مێڤانی،
تو وەره تەوافا جۆتێ مەمكێ م زەرییێ،
ژ تەرره پڕ خوەشتره، ژ ئاغاتییا رەمانییێ.
...........(١).

چاڤێ من ل رێنگاته قەرمی
لاوكۆ، وەره ده تو وەره،
برا سەرێ من قوربانا سەرێ تەبه،
شەڤەک شەڤێن ڤان پاییزان،
مێڤانێ سینگ و بەرێ دۆستا خوه به.
............(٢).

ئەرۆتجسم ب تایبەتی د سترانێن کوردی یێن ئەڤینێ دە گەلەک خورتە. د ناڤ ڤان سترانان دە مرۆڤ نکارە راستی شۆپ و رێچێن ڤولگارسمێ و دەڤژهەڤییێ بێ، ئەبەسۆر و پێخاس، ئەفراندارێ ڤان سترانان نینن، گەل ب خوەیە. ژ ئالییێ دن دەما مرۆڤ ڤان سترانان باش ئانالیز دکە، ئەو ژ سینۆری مۆتیڤێن پۆرنۆگرافیک دوور دمینن. چاوا تێ زانین ئارمانجا «ئەدەبییاتا پۆرنۆگرافیک» قامجیکرنا هیسێن خوەندەڤانان یێن جینسی نە. لێ ئەڤ سترانێن کوردی، ب هێژابوونا خوە، ژ سینۆرێ ڤێ ئەدەبییاتا پۆرنۆگرافیک گەلەک دوور کەتنە. هەر چقاس جارنا سینۆرێ ناڤبەرا ئەفراندنێن ئەرۆتیک و پۆرنۆگرفیک دەم دەم زارڤ دبن ژی، لێ بەلێ چاوا ئەم دبینن ڤان سترانان هێژاتییا خوەیا ئەدەبی وەک تێ خویان ب درێژییا سالان وندا نەکرنە، ئەڤ یەکا ژی ب سەرێ خوە پێڤانەکە. وەک میسال د ناڤ میتۆلۆژییا کوردی دە، مێرخاسا دەستانا مەم و زین یا ژنین-کەچا کورد زین، مرۆڤ چاوا لێ دنێرە مینا خوەداکە وەک ئەرۆسا یونانی و ئامۆرا رۆحانی بوویە نیشانا ئەڤینێ و ب سالان ل سەر زار-زمانێ کوردان دگەرە، ژ روومەتا خوە تو تشتەک وندا نەکرییە.

دەما گلی ژ مەم وزین هاتییە ڤەکرن، د بەرهەما ئەحمەدێ خانی دە ئەم راستی چەند ئیفادەیێن ل سەر مەمکان ژی تێن ، وەک «کەچێن مەمک هنار»و «کەچێن مەمک گلۆڤەر» ...[٣]. ئەڤ یەکا ژی نیشان ددە کو، تەما مەمکان ژ بەرێ دە د ناڤ ئەدەبییاتا کوردی یا دەڤکی و نڤیسکی دە جیە گرتییە، بوویە بابەتەکە ئەرۆتیک. ژ ئالییێ دن، ئەڤ درووڤ لێخستنێن ئەحمەدێ خانی، چاوا ئەمێ پاشێ ژی ببینن، د وارێ ناڤکرنا فۆرمێن مەمکان دە جیهەکی بنگەهین دگرن.



## پەیڤەکە ئەرۆتیک: مەمک

مەمک نیشانا، زاناڤ، کیتییا (هوڤییەت) ژنانە. ب سالان د ناڤ هەر چقلێ هونەرێن جودا دە مەمک وەک نیشانا بەرەکەت و بەدەوییێ هاتییە حەسباندن. ژ دەر فۆنکسییۆنا مەمکان یا مژاندنا زارۆکان، فۆنکسییونا مەمکان یا هەرە مەزن بێگومان ئەرۆتیکە، وەک باقە گولێن کو دەما مرۆڤ سەرێ خوە دخە ناڤ، بێن دکە، ب بێن و نەرمکییا وان مەست و سەرخوەش دبە، مەمک وسان د ژیینا مرۆڤی دە باندوور هیشتن و رۆلەکە گەلەک مەزن دلیزن، ب تایبەتی مەمکێن کەچان وەک دەولەمەندی و زەینەتەکێ هاتنە حەسباندن. ئەڤ بەدەوییا مەمکان بوویە بابەتا مەتەلۆکەکە کوردی ژی: مەمکێن قیزا زەینەتن/ کەلاخێ پیرێ رۆبەتن[٤]. د ڤی واری دە بێژەبەندەکە کوردی ژی مە گەلەکی رۆنی دکە: مەمکێ خاتوونێ. بێژەبەندا «مەمکێ خاتونێ» ب تایبەتی ژ بۆ زارۆکێن شرین و تشتێن خوەشک تێ ب کار ئانین[٥]. دیسا گۆتنەکە پێشییا، ئەڤ بەشێ بەدەنێ، هێژایی بەشێ هەری بەدەو دیتییە، وەک پیڤان هاتییە حەسبین: دلێ ترسۆنەک سینگێ گەور نابینە. ژ بۆ بال و دێنا مێران بکشینن ل سەرخوە، ژنان هەرتم مەزنبوونا «تاخما مەمکان» ژ خوە رە کرنە پیڤان و نیشانەکە ژنین. بسایا مەمکێن خوە یێن مەزن، ژنان خواستنە ژیینا سەکسوەل هن ژی سەکسوەلتر بکن. د چیرۆکا پێشکەتنا مرۆڤاتییێ دە چاوا ئەم دبینن نیشاندایینا مەمکان د سەد سالێن کەڤن دە گەلەک هێسا بوویە و ئەڤ رەحەتییا ژنان تو وەخت نەبوویە سەدەمێ سەرئێشیکە جڤاکی. هەتا نها ژی جارجار چاوا ئەم د تەلەڤزیۆن، رۆژناما و کۆڤاران دە دبینن ژنێن چەند ئێل-عەشیرێن ئافریکی بێترس و بێشەرم مەمکێن خوە

دکارن نیشـان بدن. گەلۆ بەرماییێ و نیشـانێن ڤێ تۆلەرانسا بەری هەزار
سالان چڤاس شۆپ-ریچێن خوە د ناڤ سترانێن کوردی دە هیشتنە؟ هەر
چڤاس بەرسیڤا ڤێ پرسێ ئارمانجا لێکۆلینا مە نینە ژی، لێ بەلێ ئەڤ
لێکۆلینا قەت نەبە بەرسیڤا داییینا ڤێ پرسێ هێسانتر دکە ئان ژی دبە
رەفەرانسەکە فۆلکلۆریک.

د زمانێ کوردی دە گەلەک پەیڤێن کو جیهێ مەمکان دگرن، هەنە.
بکارئانینا ڤان پەیڤان، ئانگۆری فۆنکسییۆنا مەمکان ل گەلەک جهێن
کوردستانێ دگوهرن. پەیڤا مەمک ژ پەیڤەکە لاتینی تێ: ئانگۆ ژ پەیڤا
ماما. د گەلەک زمانان دە ئەڤ پەیڤا ل جیهێ دێ/ داییک ژی تێ
بکارئانین، دەما زارۆک گازی داییکێن خوە دکن، دبێژن «ماما».... ژ بەر
کو مەمکێن مێران کۆر بوونە، پێشتا نەچوونە، پچووک و بێفۆنکسییۆن
مانە، چاوا ئەم دبینن پێوەندییێن پەیڤا مەمک و مێران قەت تونەنە. د هن
زمانان دە خوارنێن کو ژ بۆ زارۆکان ئامادە بوونە، تێن فرۆتانێ ژی، ب
«ماما» تێن ب ناڤ کرن. ب کورتی بنگەهێن ڤان هەموو پەیڤان دچن
دگێژنە پەیڤا «ماما» (دێ/داییک).د زمانێ کوردی دە چەند پەیڤ هەنە
کو گەلەک د شبینن پەیڤا ماما، وەک ملک (زاراڤێ کورمانجی). ماد
(زاراڤێ دملکی). ژ بەر کو زمانێ کوردی، زمانەکی ئیندۆ-ئەورووپی یە،
چاوا ئەم دبینن قەت نەبەیکۆکا ڤان هەموو پەیڤان وەک هەڤ. د زمانێ
فارسی دە ژی، چاوا تێ زانن ل شونا ڤێ - دایک پەیڤا مادەر تێ ب کار
ئانین، ئەو ژی نێزیکی پەیڤا مامایە. ئەڤ پەیڤا لاتینی ئانگۆری ئاڤاهییا
زمانێ کوردی، ب ئالیکارییا فۆرمێ دمنوتف (ب سایا پاشپرتکا -ک)
بوویە: مەمک د زمانێ کوردی دە ل شونا مەمک جارجار ژی ئەڤ پەیڤان
تێن ب کار ئانین: چچک، بستان، سینگ، پێسیر، پاشل، سینگبەر،



گوهان، هنگل ... پەیڤێن گوهان و هنگل زێتر د زمانێ ئارگۆیێ دە، د
زمانێ ئەبەسۆر و پێخاسان تێ ب کار ئانین. ژ ئالییێ دن، چاوا تێ زانین
پەیڤا گوهان ب تایبەتی ژ بۆ مەمکێن حەیوانان تێ ب کار ئانین، وەک
گوهانێن چێلەکان. پەیڤێن پێسیر و پاشل هەرچڤاس ل شونا مەمک تێن
ب کار ئانین ژی، ئەڤ پەیڤان زێتر وەک بەشەکە بەدەنێ ئان ژی بۆنا
کنجێن ل دۆربەرێ مەمکان، دەرباس دبە، وەک «پێسیرا خوە بگرە!»
(ئانگۆ بشکۆکێن ل دۆربەرێ مەمکان بگرە)، ئان ژی «پەرێن خوە تێخە
پاشلا خوە!» (وەک جیهەکی پاراستنا تشتان) .... د چەند سترانێن
کوردی دە ئەمێ چاوا پاشێ ژی ببینن وەک میسال مرۆڤ راستی ئیفادێن
وەک «پاشل تژی خورمەیە»و «پاشل تژی ئێمیشە» تێن .... ل ڤرا پەیڤا
«خورمە»و «ئیمیش» ب تەحرەکی سەمبۆلیک مەمکێن ژنان ئیفادە دکن.
ئانگۆری جیهـ و دەما کارئانینا ڤان پەیڤان مانەیێن وان ژی تێن گوهرین.
ب ڤی تەحری مرۆڤ دکارە ژ بۆ مێران ژی پەیڤێن پێسیر و پاشل ب کار
بینە. ل چەند جیهان میسال وەک دۆربەرێ قۆنیایێ ل شونا زارۆک
دەمشیر ژ مەمکێن دیبیا خوە دمێژە، ئەو دبێژن «پێسیر دمژە»...د گەلەک
سترانێن کوردی دە ئەم راستی ئیفادا «سینگ و بەر» تێن، ژ ڤێ ئیفادێ
ئەم ژێ دەردخن کو قالا مەمکان تێ کرن. پەیڤا سینگ هەم ژ بۆ بەشێ
بەدەنێ یێ ژۆرین (ژ قرکێ هەتا ناڤا مرۆڤان)، هەم ژی، ژ بۆ جۆتێ
مەمکان تێ ب کارئانین. د گەلەک زمانان دە هەم ژ بۆ ڤێ بەشا بەدەنێ،
هەم ژی ژ بۆ جۆتێ مەمکان تەنێ پەیڤەک تێ ب کارئانین، لێ بەلێ د
کوردی دە گەلەک پەیڤ هەنە. چاوا ئەم دبینن د زمانێ کوردی دە جار جار
ئەڤ بەشان ب دو پەیڤان ڤە تێن ب ناڤ کرن: سینگ و مەمک، ئەڤ
پەیڤان وەک دو پەیڤێن هەڤناڤەرۆک (سینۆنیم) ژی تێن ب کارئانین. ب

کورتی ب پەیڤێن مەمک و سینگ وەک دو پەیڤێن ئەڤینێ و ئەرۆتیک د سترانێن کوردی دە زێتر دەرباس دبن. د گەلەک سترانێن کوردی دە ئەم راستی ئیفادە یێن «سینگ و بەر» ژی تێن. گەلۆ پەیڤا بەر ژ کو تێ؟ د زمانێ کوردی دە پەیڤا بەر جارجار ژ بۆ فێتقیبیان و ژ بۆ «پێش» (وەک بەشێ پێشین یێ بەدەنێ!) تێ ب کارئانین. دەما مرۆڤ مانەیێن ڤێ پەیڤێ ب مەمکان ڤە گرێ ددە، مرۆڤ راستی شۆپێن هەڤگرێدانەکێ تێ د ڤێ ناڤکرنێ دە مانتقەکێ ژی دبینە. د زمانێ دەڤکی دە هەرچقاس پەیڤا چچک ل شونا مەمک تێ ب کارئانین ژی، د زمانێ نڤیسکی دە ئەم ئەوقاسی راستی ڤێ نایێن. د سترانێن کوردی دە قاسی مەمکان، ئەم راستی ئیفادا سەرێ مەمکان (ب لاتینی مامللان) ژی تێن. سەرێ مەمکان هەم ژ ئالییێ تەحر، رەنگ، تام، هەم ژی ب فۆنکسییۆنێن خوە ڤە د ڤان سترانان دە جیهەکی تایبەتی دگرن. چاوا تێ زانین ل دۆرا سەرێ مەمکان بەشەکە وەک باخچەکی ژ گوپک و خالان پێک هاتی ژی هەیە، ژێ رە ب لاتینی دبێژن «ئارەۆلا ماماتە» (باخچێ خالان). د سترانەکە کوردی دە قالا ڤی «باخچێ گولان» تێ کرن: «تاخمێ سینگ و بەرێ عەیشانا من گیهشتنە/ خالێن زەر و سۆر کەتنێ»[٦] . د چەند سترانان دە ئەم راستی ئیفادا «خال و خەتێ مەمکان» تێن، ئەڤ ئیفادا وسان تێ خویانێ کو ژ بۆ ڤان گوپکێن ل دۆرا سەرێ مەمکان جیه دگرن، هاتییە ب کارئانین.



## پێشکێشا مەمکان

د سترانێن کوردی دە تشتێ هەری بالکێش، پرانییا سترانێن کو ل سەر مەمکان هاتنە گوتن، ژ دەڤێ ژنان دەرکەتنە . ئەڤ یەکا دەربارەی شکاندنا چەند تابوویان، جیهێ ژنان و دەربارەیی ئاکتیڤبوونا ژنان د پێوەندییێن جینسی دە ئان ژی دەربارەی رۆلا وان د جڤاتێ دە، مە گەلەکی رۆنی دکن. د چەند جڤاتێن ئیسلامی دە ل سەر مەمکان پەیڤێن، ستران گۆتن و پەسندایینا وان ئەوقاس هێسانەبوویە، وەک چاوا د زمانێ ترکی دە ژی تێ خویان تەما مەمکان، تەماکە ئەوقاس بەربچاڤ، خورت نینە، وەک سترانێن کوردی ئەوقاس ب ڤەکری ئەڤ تەما د سترانێن ترکی دە جیه ناگرە. گەلۆ مرۆڤ ژ سەردەمێن کەڤن هەتا نها ڤێ یەکێ وەک سەردەستیکە ژنان دکارە بحەسبینە ئان ژی نیشان بدە؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ بابەتا ڤێ لێکۆلینا مە نین بە ژی، لێ بەلێ ئەڤ یەکا بابەتەکە گەلەک بالکێش و هێژایی لێکۆلینێ یە.

دەما دلێ کەچ/ ژنەکە کورد دکەڤە یەکی، ل سەر بەنگین دبە جارا پێشین د ڤان سترانان دە، ئەو مەمکێن خوە پێشکێش لاوکێ خوە دکە، دەستوورەکێ دەردخە، هەموو ترسێ ژ سەرخوە داڤێژە و مەمکێن خوە پێشکێشی «حەلالییێ جانێ خوە» ئان ژی «خەلقێ دەلال» و «خەلقێ تێلی» دکە، ژن ڤان دلکەتییان د کاتە گۆریکە تایبەتی دە (خەلقێ دەلال) (خەلقێ تێلی) جیوار دکە، دلکەتییێ خوە ژ سەر هەر کەسی رە دبینە:

دەروێشێ عەڤدی

.......

منێ دەستمالا سۆر گول-گولی ئانی،
چفتا زەر مەمکا ناڤدا گرێدا
ئو بەر دەلالێ دلێ خوە پێشکێش دانی.
........[٧]

ئاحمەدۆ رۆنی

........

ئاحمەدۆ رۆنی، حەیران ناڤێ من بەسنایە،
تلی، پێچییێ منە، مارموتی ئال شەمایە،
سینگ و بەرێ من عەڤدالا خوەدێ کۆشک سەرا و چیمایە،
سەرێ قرانێ پەزێ خوە سەردا گێرکە،
منێ حەمدێ خوە تەرە دەستوور دایە.
.......[٨]

ژ بۆ کو دەلالییێن خوە دلشا بکن، ژن هەموو ئیمکانێن خوە پێشکێش دکن، پێشکێشا هەرە گرانبها، بێگومان د ڤان ستڕانان دە جۆتێ مەمکانە، ژ بەر ڤێ یەکێ ژی گازییێن ژنان تەحرێ خوە دگوهرین، رەنگەکی ئەرۆتیک وەردگرن. د ڤێ ستڕانا ژێرین دە چ ژ دەستێ ژنێ تێ پێشکێش دکە:

هەی لۆ لۆ دەلال ....
دەلێ لۆ حەیران



وەزێ دەلالێ مالێ برێکم،
وەزێ تاشتێکێ ژ دەلالییێ مالێ رە چێکم
وەزێ تەمامێ روونێ خنسان ژێ رە لێکم.
ئەگەر قیما دەلالێ مالێ پێ نەیێ
وەزێ جۆتێ مەمکان ژێ رە پێشکێش کم.

هەی لۆ لۆ دەلال ...

دەلێ لۆ حەیران،
بەریکا مێردینێ بەریکی دووزە.
پۆزێ قەرەجداغا شەوتی ل سەردا خووزە
ناڤا سینگێ مەحبووبێ من، عەڤدالێ
تەمام زیڤ و زێر-ئالتوونە.
.........[٩].

دەما کەسەک مزگینییا هاتنا لاوکێ (دلکەتییێ) کەچەکێ ژێ رە بینە، کەچک دکارە! ژ جۆتێ مەمکان یەکێ پێشکێشی کەسێ کو مزگینێ ئانییە، بکە. ئەڤ یەکا بێگومان خورتبوونا ئەڤینێ و حەزکرنا دلکەتییان نیشان ددە، میسالا کەسێ مزگینێ تینە چاوا تێ خویان نە دلکەتییێ کەچکێ یە، لێ بەلێ ئەو دکارە مەمکەکی خوە پێشکێشی وی کەسی بکە (بێگومان تەنێ ب رییا فۆلکلۆرێ)، ئەڤ یەکا ژی، د رەئالیتێ دە خورتبوونا ئەڤینا ژنێ تەمیسل دکە:

لاوکۆ قوربا، گریداغا بەربی وەلات،
هەجی کەسێ بێژە-گەدە لاوکێ تە هات،

ئەزێ چەڤی چەپێ مەمکێ راستێ
بدم پێشکێش، خەلات
........ [١٠] .

د ڤێ سترانا ژێرین دە، ڤێ جارێ کەچک ئامادەیە وەکی «رامووسانا روویێ راستێ» ژی پێشکێشی کەسێ سالغدایی بکە»:

دەلالێ بەرییێ

........
منێ سۆندا مەزن خوارییە
هەچی سالۆخەکێ ژ دەلالێ مالێ ژ مە رە بینە
ئەزێ بدم هەفت ئاشێ مالا باڤێ خوە رەبەنێ
ل بەر چەمێ نسێبینێ.
ئەگەر پێ رازی نەبوو، ئەزێ رامووسانا رووکێ راستێ،
بدم ب مزگینی.
هەی لۆ لۆ .....[١١].

جارجار د ڤان سترانان دە ژن بۆ حەزکرییێ/ دلکەتییێ خوە هەرتم ئامادەیە وەکی لاوکێ وێ، خوە بگهینە جۆتی مەمکان، مەرج و هۆیان ب خوە ئامادە دکە، بێسەبرییا ژنان جارجار سینوران دەرباس دبە. دەما ژ ئالییێ دێ/ باڤان دە، ژ ئالییێ مێرێن خراب دە تەنگاسی و دژواری پەیدا دبن، ژن ژ بۆ دلکەتییێ وێ، خوە بگیهینە جۆتێ مەمکان گەلەکی سەرێ خوە ل سەر پلانێن جودا دێشینە. ژن ناخوازە کەس ژ ڤێ هەڤدودیتنێ ئاگاهدار ببە. دەما مرۆڤ راستییێ دگەرە ژنا کورد ئەڤینا دو کەسان سەر هەر تشتی رە دیتییە ئەڤ یەکا بوویە وەک هیمەکی فەلسەفیک. کەسێ



ئۆرتا دو دلا و چار چاڤان خەبەر ددە، برا خێرێ-وایێ قەت نەبینە. دەما مرۆڤ ل سەر ڤان پەیڤێن زێرین دفکرە، مرۆڤ دبینە کو ژنا کورد ژ ئالییێ سەربەستی و داخوازییێن خوە دە چقاس رەحەت فکرییە. لێ دیسا ژن، ژ بەر چەند دوارییان مەجبوور مینە خوە دپارێزە، وەک میسال ژن دەما «هیڤ وندا بوو» دۆربەر تام تاری بوو، وێ چاخێ دلشایە، «فتارا خوە» دکە، خوە ئەمین د حەسبینە:

هیڤا گوندێ مە دەرکەتییە، هیڤا ساڤا
هیڤ خەیدییە، تەلا بەختێ من و تە رە ناچە ئاڤا،
لاوکۆ قوربا، هیڤ چوو ئاڤا، پاشێ وەرە،
دە تو وەرە، سەر سینگێ من عەڤدالا خوەدێ ڤە کە،
فۆرما تۆیێ پێز، ماستێ مەداکا شەکر سەرە.[١٢].

هەرێ دە مێڤان

.........
مێڤان، قوربا هەرکێ تو پرسا تامێ مالا باڤێ من دکی،
تامێ هەری پێشینە،
دو جێرگە دیوارێ وی نە
چارگۆشە دانینە.
پاشییا تە ولا مالا باڤێ من قولە،
شەڤ نیڤە شەڤێ تێ دە وەرێ خارێ.
هەر کە دێ و باڤێ من پێ حسیان،

ئەزێ بێژم–نە مێڤانێ سینگ و بەرێ منە،
قەرەولێ شەڤێ یە،
شاش بوویە.
هاتییە ئاڤێ دگەرە، تی یە.
.........(١٣)

د چەند سترانان دە هەڤدو دیتنا کەچ/خۆرتان ب سایا پێشکێش کرنا مەمکان، دبە عەدەتەکی نووژەن–هەڤدەم. چاوا تێ خویان، ڤێ جارێ کەچ ل دیبیا خوە شیرەتان دکە و یا دلێ خوە ڤەناشێرە:

وەرە مالا باڤێ من کەچکێ ب شەڤە،
ئەزێ جیبیا ژ خوە و دەلالێ مالێ رە داینم تەڤل هەڤە،
هەگەر دیبیا م گۆ: «چ بوو، چ چرییا؟»
ئەزێ بێژم: «پۆرکورێ، عەدەتێ خۆرت و کەچێ ڤی
زەمانی یەک ژی ئەڤە.
یادێ، ئیرۆ سێ رۆ دەلالێ دلێ من خەبیدییە،
ئەزێ جۆتێ مەمکا باڤێم دەڤە»(١٤).

د ناڤ سترانێن کوردی دە پێشکێش کرنا مەمکان هەموو شک، دژواری و نەباوەرییێن ناڤبەرا ژن/مێران یەکتەن ژ ئۆرتێ رادکە، ئەڤ ئیفادە یێن پێشکێش و خەلاتان مرۆڤ دکارە بێژە، د ڤان سترانان دا دبن مانیفەستۆیێن ئەڤینێ. ژ ئالییێ دن چاوا ئەم پاشێ ژی د بینن، ژن دکارن ڤان مانیفەستۆیان بقەلێشن و باڤێژن ئالیکی ژی. ئەڤ یەکا ژی د فۆلکلۆرا کوردی دە نیشانێن دلساری، حەزنەکرن و بێدلییێ رابەری مە دکن. ئەڤ پرۆتەستۆ و دژیدەرکەتنان دیسا دەربارەیی رۆلا ژنان دە مە گەلەکی ئاگاهدار دکن.



دەما ژن مەمکێن خوە پێشکێش دکە، نە تەنێ پێشکێش کرن، جارجار قالا «تاپوکرن»ێ «تانزیم»ێ ژی دکە:

باڤێ سەیرۆ

باڤێ سەیرۆ قوربا! چما تو دەیناکی؟
هەر چار مالێ ئالوجا ل قوونا دییێر دەمام ناکی؟
سینگ و بەرێ من کەچکی وەکە باخچێ زنارا مێردینێ
ژ خوە رە تاپو ناکی
.......(١٥)

د شاخەکە ڤێ سترانێ یا مایین دە ئەڤ تاپوکرنا، وەک «تاپو و تانزیم» دەرباس دبە.(١٦).

## ل دۆرا مەمکان باریکاتێن ئەدەبی تێن کشاندن

چاوا تێ خویان، دەما کەچەکێ دل کر، بێترس دکارە ب دلشاهی مەمکێن خوە پێشکێشی دەلالییێ جانێ خوە بکە. د مەرج و هۆیێن زەواجا بێدل دە، ئێدی کەچ ڤێ جۆمەردییێ نیشان نادن، ئەوقاس «سینگڤەکری» نینن. مەمک پارا کێ یە؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ ب داخوازییا کەچێ ڤە گرێدایی یە. د سەرپێهاتییا حەجی موسا و گولا ئەرمەنی دە، حەجی موسا تێ پرۆتەستۆکرن، گولێ تێ رووسپی کرن. ژ بەر کو گولێ ناخوازە ببە ژنا حەجی موسا، دلکەتیکی وێ هەیە، ناڤێ وی مقسی یە. ئەڤ کەچکا ئەرمەنی ئەتینڤیسا خوە ژ زوودا کفش کرییە: ..... هەتا ئەز ل دارێ دنیایێ ساخ بم، جۆتێ مەمکێ من، وێ ژ مقسییێ لاوێ ئاپێ من رە بە ....

.........

حەجی موسا بەگێ بان کر:
ئەمان گولێ ئەڤ سبەیە، خوەش سبەیە،
تو کەرەم کە ئەزێ بسکێ وەرم حندا تەیە،
ئەزێ ماچ کم جۆتێ مەمکێ تەیە،
مرن هەیە، قەبرا تاری مالا مەیە،
گولێ بان کر: ئەمان بەگۆ وەر مە بێژە،
ژ دینێ باڤێ من رە پڕ خرابە
قەشە رابوو ژ بەر راهبە،
هەتا ئەز ل دارێ دنیایێ ساخ بم،
جۆتێ مەمکێ من وێ مکسییێ لاوێ ئاپێ من رە بە.
.........[17].

د چەند سترانان دە، دەما دلکەتییێ کەچەکێ ژ مەیدانێ ڤەدکشە، بار دکە ئان ژی دچە دلۆڤانیا خوە، کەچ سۆند دخوە وەکی ئێدی سینگ و بەرێ خوە ڤەنەکە، ژ بۆ بیرئانینا دلکەتییێ خوە، ئەو مەجبوور دمینە ڤێ گاڤێ داڤێژە: ... ئەزێ سینگێ خوە بکم حەپسخانە / دەستێ خەلقێ نەچە ناڤ مەمکان[18]. ڤەنەکرنا مەمکان د داوییێ دە دبە بەشەکە شینێ:

..........

ئەز ئاد دکم، پاشێ تە ئەز سینگ و بەران ڤەناکم،
پۆر و گولییان شە ناکم،
بسک و گولییان درێژ ناکم ژ بادانێ،
چاڤان کل نادم ژ کلدانێ،
.........[19].



د چەند سترانان دە چاوا پێشتا تێ، ژن دکارن هەتا رۆژا مرنێ سینگ و بەرێ خوە پەردەکن، ڤەشێرن، چارمەدۆرا سینگ بپارێزن. ژ بۆ کو کەسەکی مایین دەستێ خوە درێژی سینگ و بەران نەکە، دەری کولەکان دگرن، ئەو، چەپەران، هەسەران دکشینن دۆرا مەمکان، وەک باخ و بۆستانەکی. لێ بەلێ دەما دل دکر، وێ چاخێ هەر تشت دگوهرە:

..........

کەرەم کە ژۆرێ ببە عەزیز مێڤانە،
ژ سەفەرێ هاتی، عەزیبەت دینە، عەزەبێ گرانە،
ئەمێ شەرمییێ باڤێژن بەر پییانە،
گەردانا من کوپی هنگڤینە،
شرین-شرین بمژینە.
پەردا ئەدەبێ ژ بەر هلینە،
باخ و بۆستانی من گیهشتینە،
هەسار کری بۆ تە من هێشتنە،
بکەڤە ناڤە، گول سۆسنان ژێ بچینە.
........[20].

د ڤان خەتان دە دەرباسبوونا «پەردا ئەدەبێ ژ بەر هلینە» و «ئەمێ شەرمییێ باڤێژن ئالیکی بەر پییانە»، وەک دو نیشانێن سەربەستی و رەحەتییا ژییانا سەکسوەل گەلەک گرنگن، هلدا ناپەردا ئەدەبێ مرۆڤ دکارە وەک چەند نیشانێن ژیینا ئەڤینداریێ و ژیینا سەکسوەل یێن هەرە بنگەهین، هەرە رادیکال بحەسبینە. دەما مرۆڤ ل سەر پێوەندییێن ژن-مێران یێن جینسی دفکرە، ئەڤ ئیفادان گەلەک هینکار و پەروەردەکارن.

## فۆنكسييۆنێن مەمكان يێن دووەمين

مەمك وەك دەستخستنا هەوجەدارييێن سەكسوەل ئۆرگانەكە بنگەهينە، ژ بۆ كو هەر دو ئالی (ژن–مێر) د وارێ سەكسوەل دە تێر بن، خوە رەحەت بحەسبينن، مەمك رۆلەكە مەزن دليزن، ئەڤ يەكا وەك فۆنكسييۆنا مەمكان يا يەكەمين دكارە بێ ناڤكرن ب مەمكان شابوون، ماچكرنا وان، تەڤ دان، گەزكرن، برن–ئانين و مزدانا وان، رەحەتيكە مەزن ددە هەردو ئالييان. ژ دەرڤێ فۆنكسييونا مەمكان، دەنگبێژ چەند فۆنكسييۆنێن ماين ژی سپارتييە مەمكان ئان ژی مەمك دبن نيشانێن هەوجەدارييێن ماين، وەك دەرمان، خارن – ڤەخارن و مژوولی....

أ– **وەك دەرمان:** ژ بۆ قەنجكرنا برينێن مێرێن خوە، دلكەتييێن خوە، د چەند ستراناندە چاوا ئەم دبينن ژنان خواستييە مەمكێن خوە بكن دەرمان و مەلحەم تێخن دەڤێ برينان، هەم مێر، هەم ژی ژن هەر يەك ژ ئالييێ خوە دە گهيشتييە باوەريكێ: مەمك دەرمانە. ژ بۆ كو بەر دلێ بريندار دە بێ، سترانبێژا ژنين ژ سەر جۆتێ مەمكێن خوە رە تو تشتەكی گرانبها نەديتييە وەكی پێ بيرينێن برينداران بپێچە:

باڤێ فەخرۆ
ئەز چوومە بۆلندێ سەبرييێ حەجی نە ل مالە،
دبێن ل شەرێ تركا، ل پرا باتمانێ بريندارە،
نزانم چ ستەقلالا شێخ سەعيد، فەرمانا كوردان رابوويە،
بەرێ سەبری تەڤ برنە دانە ئەلەمانە،
دترسم برينا سەبرييێ حەجی ل بنيا خەتێ،
بێ حەكيم و بێ دەرمانە،



منێ جۆتێ زەر مەمكێ خوە بقەلاشتا،
ژێرە بكرا ميل، مەلحەم و سەر دەرمانە،
..........(٢١).

ئەڤ ستران ژ ئاليكی دە نێزێك سترانێن شينێ دبن، هەرچقاس مرن–كوشتن تونە بە ژی، چاوا تێ خويان شين و گريك هەيە. د رەوشەكە ئاوا دە قالا مەمكان كرن، ئەز باوەر دكم زێتر ب داخوازا قەنجبوونا بريندار ڤە گرێدايی يە، كەچك دخوازە ب مۆتيڤا مەمكان هێڤيا خەلاسبوونێ ل بال بريندار زێتر بكە، بينا وی فرەه بگرە، بۆ ڤێ يەكێ ژی دچە بال حەكيمێ فللەه (ئەراكێل):

باڤێ فەخرييا
..........
باڤێ فەخرييا قوربا!
ژ ئينێ هەتا ئينێ،
ئيرۆ سێ رۆ باڤێ فەخرۆ بريندارە،
د ناڤ نڤنيێ. وەی ل منێ!
ئەزێ رابم داو دەلنگێ خوە هلگێڤم،
هەرم ها دهاكا خۆپان، مالا ئەراكێلێ حەكيم،
ئەزێ بێژم: ئەراكێلۆ قوربا! سينگ و بەرێ من كەچكێ،
بكە مەلحەما دەڤێ ڤێ برينێ.
..........(٢٢).

د چەند سترانێ ماين دە ژی، ئەم راستی ئيفادا وەك «مەمك دەرمانن» تێن. ب تايبەتی كەسێ ژ دلكەتييا خوە دوور بكەڤە، دچە غەريبستانێ، گەلەك جاران بەدحال دكەڤە، كەڕ–گێژ دبە، كەچك ژ بەر

ڤی دەردێ دوورکەتنێ، ب سترانەکێ بە ژی، دچە هەوارییا وی، د بەر دلێ وی دە تێ، دخوازە تمێ بینا لاوکێ خوە فرەھ بگرە:

لاوکۆ

دلێ من ل سەر دلێ من رە کالە-کالە،
ئیرۆ جابەک ژ من رە هاتییە، دبێ لاوکێ تە،
ل وەلاتێ غەریبییێ نەخواشە، پڕ بەدحالە،
ل وەلاتێ غەریبییێ نە بالگی یە، نە دۆشەک، نە پەرپالە،
ئەزێ ئیزنێ ژ دێ باڤێ خوە بخوازم،
هەرم وەلاتێ غەریب، خوە ژێ رە بکم بالگی،
سینگێ خوە بکەم پەرپالە،
بلا لاوکێ من ب کێف بە، ئێدی مە نالە.
...........[23].

**B. وەک ستار:** مەمک هەم ژ ئالییێ نەرمبوونا خوە، هەم ژی ب گەرمبوونا خوە ڤە وەک ستارەکە گرانبها هاتییە حەسباندن، وەک کۆشک و سەرایێ هاتییە ب ناڤ کرن، ئانگۆری ڤان ستڕانان مرۆڤ تەنێ د ناڤ سینگ و بەران دە دکارە بینا خوە دەرخە، ئان ژی د شەڤێن زڤستانێ دە، خوە د ناڤ دە گەرم بکە: خوەزلا شەڤەکێ ژ شەڤێن چلێ کانونا زڤستانێ د بەر سینگ و بەرێ خەلکا تێلی دە ببووما مێڤان ......[24]. ژ ئالییێ دن د چەند ستڕانان دە مەمک وەک بالگی ئان ژی وەک مەسکەن هاتنە ب ناڤ کرن:

.........
چاڤێد خوە ژێ رە بکم ساقی وەختێ شەراب گەرانێ،
سینگێ خوە ژێ رە بکم بالگی وەختێ پالڤەدانێ



..........[25].

د سترانەکە مایین دە ژی، ڤێ جارێ کەچ سینگێ خوە دکە مەسکەن وەک جیهەکی ستارێ:

..........
سینگێ م ژ تەرە باخچەیە،
گول و رحان تێدایە،
مەسکەنێ من و تەیە
.........[26].

هەمبێزکرن ژ ئالییێ ژن-مێر دە وەک ئاڤاهیکە ئەڤینێ هاتییە دیتن، دەما مێر دکەڤە ناڤ سینگ و بەران، ئەڤ ئاڤاهی هەموو شانا خوە د ڤان ستڕانان دە نیشان ددە:

حەسۆ

حەسۆ، ئیشەڤ شەڤە، شەڤ وێ ب شلی یە،
گوهێرا هۆگەچێ تە ئاڤە، ئاڤهەری یە،
وەرە تێکەڤە ناڤ دەست ئۆرخان-دۆشەکێ قاستووکییە،
هەرگە قیما تە دەست ئۆرخان- دۆشەکێ قاستووکی نایێ،
بەرسەرێ تە جۆتێ زەر مەمکا سەری سۆری، بنی سپی یە،
..........[27]

**ج. وەک رۆناهیییێ:** د چەند ستڕانان دە مەمک شەمال ددن، وەک «شەمالا شەڤێ»[28] هاتنە دیتن، رۆناهی و تیرێژێن ل دۆربەرێ مەمکان

پەیدا دبە، ئانگۆری باوەرییا دەنگبێژ تارییا شەڤێ بەلاڤ دکە:

عەیشێ

عەیشێ قوربا، دلێ من قیز و بووکێ ڤان کۆچەرا،
سینگ و بەرێ عەیشا من ئوسانە،
نۆلا هیڤەرۆنا ڤان پاییزا سەرێ بێدەرا،
.........[٢٩]

گەلۆ سترانبێژ چاوا ئەڤ رۆناهی و شەمالا مەمکان کەفش کرییە؟ ب باوەرییا مە، ئەڤ یەکا ب ئاڤاهییا مەمکان ڤە دکارە بێ شرۆڤە کرن. ژ بەر کو د شەڤێن تاری دە ئانگۆری بەشێن بەدەنێ یێن ماین مەمک باشتر خوە نیشان ددن (وەک دو چیاییێن مەزن) ئانگۆری بەشێن ماین، مەمک وەک بلند جیهەکی چێتر خویا دبن ئان ژی ب پەیڤێن سترانبێژ «شەمال ددن»، وەک «هیڤەرۆنێ» رۆناهییێ دبارین.

**چ. وەک مژوولی:** دەما بینا لاوکێ کەچەکێ تەنگ دبە، خەو ناکەڤە چاڤ ئان ژی ل سەر رێ یە، دچە غەریبییێ ئان ژی شەڤێن درێژ دەما وەخت دەرباس نابە، کەچ د گەلەک سترانان دە گازی لاوکێ خوە دکە وەکی بێ تێکەڤە ناڤ سینگ و بەران، ژ خوە رە مژوول بە، ب مەمکان شا بە، پێ بلیزە. ب کورتی مەمک وەک چاڤکانیکە بینفرەهییێ و چەرەزێ شەڤبهورییێ د ڤان ستران دە دەرباس دبن:

شاهینۆ

شاهینۆ، دینۆ تو دینی، تو نە م دستینی، نە درەڤینی،



نەختکێ م گرانە، تێ ژ کو بینی،
تو ژ خوەدێ ناترسی ئەتفا زیڤی ل سەر سینگێ م د هەژینی،
سینگێ م باخچێ گولان و سێڤانە، دەما بینا تە تەنگ بی،
وەرە دەمەکێ، دا تو خەمێن دلێ خوە ژێ برەڤینی.

دو زەری

.......
جانێ جانێ،
دو زەری بەر دەریکێ مالا باڤێ من رێزە،
خویشکا مەزن یا پچووک رە دگۆت:
«ئیشەڤ مێڤانەکی هاتییە مالا باڤێ من و تە
رەبەنێ پر عەزیزە.
ئەزێ نزانم ژێ رە چ پێشکێش، چ لاییقی، چ جاییزە،
ئەزێ ژ شەڤەکێ، نیڤێ شەڤان
پێدا ژێ رە تەسلیم بکم جۆتێ زەر مەمکان،
شەفێ چلان و کانوونان دوو ڤە درێژە،
رابە، روونێ و پێ بلیزە»[٣١].

ژ ئالییێ دن دەما دلکەتییێ کەچەکێ دچە خەریبییێ، لەشکرییێ ئان ژی وەلاتێن دوور، وێ دەمێ کەچ مەمکێن خوە پێشکێشی بینتەنگان دکە:

گۆندەرا رەشێ

........
وەکی تێ جارەکێ مالا باڤێ م بڤی مێڤانداری،

ئەزێ جیهێ تە داینم یالێ ئۆدێ،
ئەزێ جۆتێ زەرمەمکا پێشکێشی نەفسا جانێ تەکم،
خوە رە تێر شابە، هەتانی سبێ.
..........[٣٢]

ستـرانبـێـژ، مـەمک جـار جـار ژی وەک بەسـتـەکە گـەرێ، سـەیرانێ حەسباندییە، مرۆڤ دکارە تێدا بینا خوە دەرخە، کێفا خوە بنێرە: سینگێ من ژ خوە رە بکە باخە/ ناف بگەرە تاخ ب تاخە[٣٣] .

ژ بۆ بەدەن مەست ببە، رەحەت ببە، مەمک وەک بەستەکە سپۆرتیف دکارن فۆنکسییۆنەکە مایین ژی بلیزن: ... دەلالێ دلێ من هاتبوون من ببینە/ خوە د ناف باخ و بۆستانێ من دە بڤە-بینە[٣٤]. ئەڤ ئیـمکانا پەیدابوونا گەڕ، سەیران و سپۆرێ، ب باوەرییا مە، ژ هەبوونا زێدەبوون مەمکان تێ، دلکەتییێ مێرین یەک چەپ، یەک راست لێ دخە، مەجبورە خوە بگەڤزینە، دەما دل بکە هەر دو مەمکان، ناڤمەمکان، سەرێ مەمکان بنێرە، ئەڤ یەکا ژی حەرەکەت دخوازە، پێویستە خوە بلڤینە ئان ژی مەمکان یەک بلەقینە. دەما دبێژن «مەمک دەریا خۆرتانە»،، بنگەهێ ڤێ باوەرییێ، ل سەر ڤێ راستییا زۆرین ئاڤا دبە. دەما یەک ئاڤژەنی دکە، نکارە جیهێ خوە دە بسەکنە، ئەو پێویستە خوە بلڤینە. سترانبێژ هەموو ئەڤ رووچکێن ژیینێ و ئاڤاهییا مەمکان دایە ل بەرچاڤان، خوە گیهاندییە دنیا فانتازییان.

**د. وەک چەرەز:** د گەلەک سترانان دە مەمک وەک خوارنێن جودا دەرباس دبن. ئەم ژ ڤان سترانان فام دکن کو تام و خوەشییا مەمکان ل سەر زارێ دەنگبێژ دەمەکە درێژ مایە، ژی تێر نەبوویە. چاوا ئەمێ پاشێ ژی ببینن، د گەلەک سترانان دە مەمک وەک فێکییان هاتنە ناف کرن. ژ



دەر فێکییان ئەم راستی ئیفادە و خوارنین ژی تێن وەک تاشتێ، فراڤین، شیڤ، پاشیڤ، دمس، پەرەز، تۆ، کەباب، هنگڤ، وەک میسال: ئەزێ سەرێ مەمکێ خوە بچلپینم/ ژ کالان رە بکم تاشتێ، ژ خۆرتان رە بکم فراڤینێ ....[٣٥].

## فۆنکسییۆنێن مەمکان یێن دووەمیی

د چەند سترانێن کوردی و شاخێن وان دە چاوا ئەم دبینن، ژن ئەوقاس زەواجا خوە دلشا نینن، مێرێن وان ئان ژی دلکەتییێن وان «مێرێن ژ هەقێ مەمکان دەرناکەڤن» تێن ب ناف کرن. ئەڤ مێران ژ ئالییێ ژنان دە جارجار وەک مێر نایێن حەسباندن، ناڤێن مایین ل وان تێن کرن، وەک مێرێن چەپەر، شندۆ، شندۆنەک، کوند، کوندۆ، نە مێر، شلەک، مێرێن کۆتی، ملمەلەستی، سەرژنک، پنتی، سەرهەڤدە، مێرێن کۆتی، دەوار، مێرێن شل-شێت، مردار ..... سەدەمێن ڤێ دلساربییێ گەلەکن، وەک ب دارێ زۆرێ ڤە هاتن رەڤاندن، زەواجا بێدل، هێوی ئانین، چاڤدەرییا مێران، ژ مێرتییێ کەتن و گەلەک فاکتۆرێن مایین ..... د داوییێ دە، ئەڤ سارتییا مالێ د پێوەندییێن جنسی دە دگهێژە دەرەجەکە بلند. ئێدی رەحەتی ژ ژنان رە نامینە:

یادێ ناڤێ من کەچکێ بەسنا بەسناییێ،
وەیلا من پۆرسۆرێ پۆر بەلاییێ،
تەنییا موشێ، هەشا حەلەبێ ل خوە داییێ،
باڤێ من خێرێ بکی ب چاڤێ سەرێ خوە نەبینی.

چاوا نەدامە خۆرتەکی ژ مالا حەسەن ئاغا ئاپێ بەهری،
سمبل سۆرێ سەر خانییا، دەستمالا دەست لاوکا،
رۆژا داوەت و عەید و شاهییا،
ئەز دامە ئیبراهیمێ تەمێ، هرچێ بووبیلانی،
کەرقۆلانێ رێیا نسێبینێ،
هەق ژ سینگ و بەرێ من دەرنایێ،
یادێ رەبەنێ، بەسێ رەبەنێ[٣٦].

ژن، ژ مێرێن کو «شەڤێ هەتا سبێ پشتا خوە ددنە ژنان» حەز ناکن. هەموو ئەڤ یەکان، ژ ژنان رە دیتنا ئیمکانا دلکەتییێن نووە پەیدا دکە، وەک چاوا د سترانەکێ دە ژی تێ خویان، ژن گازی دلکەتییێ خوە یێ نووە دکە: وەرە تەرەسێ کوچکێ مێرێ من بکوژە .... د ڤان سترانان دە چاوا تێ خویان ژن گەلک خەمگین و دلسارن:

دەرییێ مالا باڤێ من یاتامێ ب تۆز و مژە
دە رابە تەرەسێ کوچکێ مێرێ من بکوژە
تێ دەڤێ خوە تێخە خان و مان گەردەنێ
جۆتێ مەمکا ژ خوە رە بمژە[٣٧].

خەلیلێ غازی

........

ئەزێ دییاربەکرا شەوتی کەتم ب مشمشە،
تۆڤ و بەنییێ م رەبەنێ سەر بەژنا زراڤ خوشە خوشە،
برا باڤێ من خێرێ بکە، خێرێ نەبینە،



چاوا ئەزێ نەدام خەلیلێ غازی، لاوکێ کورمانج،
ئەزێ دام کوم ب قولکی ژ ڤانێ باژارییا،
ژ ئێڤارێ هەتا سبێ ل سەر سینگێ من دپۆنژە[٣٨].

چاوا د ڤان سترانان دە ب ڤەکری تێ خویان کو، ژن ژ مێرێ خوە رازی نینە. د سترانا خەرابۆ یا د ناف خەتێن وێ دە ل دژی مێرێ خراب پرۆتەستۆکە گەلەک تووژ هەیە، مرۆڤ دکارە گەلەکی ب هێسانی ڤێ نەرازیبوونێ ببینە. ئەڤ سترانا ژ دڤێ ژنەکە دل ب کەسەر تێ ستراندن، چاوا ئەم ژ ناڤەرۆکا سترانێ تێدگهێن مێرێ ژنکێ کەسەکی چاڤدەرە، ژنخاپینۆکە، د ناف مالان دگەرە، د سترانێ دە مۆتیفا مەمکان گەلەک خورتە، ژنک ب ئالیکارییا ڤێ مۆتیڤێ قەت نەبە ل شوندا ڤەگەرینا مێرێ خوە هێڤی دکە، گازن، لۆمە، شیرەت د سترانێ دە تەڤلهەڤ دبن، ژنک ب ڤی تەحری هوندرێ خوە درێژە. ستران ب ڤان خەتان دەست پێ دکە: روهێ بزدۆنەک ب سینگێ گەور شا نابە .... ئەڤ ئیفادا د ناف سالان دە بوویە گۆتنەکە پێشییا و د زمانێ کوردی دە جیە گرتییە.

دە خەرابۆ

........

دە خەرابۆ، دەخەرابۆ تاخمێ سینگ و بەرێ م کارا خەزالا،
ژ تە رە نۆلا قەسرا پیرۆتا ل مێردینا شەوتی، نووە جامکری
نا وەللە نۆلا گوشییەک ترییێ چێلیکێ عەلییێ رەمۆ
دکان و مێوا خوە دە نووە کەملین.

........

خەرابۆ، مال شەوتییۆ، ئەز ژ تە رە دبێم تو هەر شەڤا خوەدێ،
وەر تەوافا سینگ و بەرا، رامووسانێ جۆتێ مەمکێ م کارا خەزالان.

ژ ته ره نۆلا سێنیەک بەردیرێ یێ تەرە.
ل مێرگه میرا ژۆرین ل قەرەداغا شەوتی، تو بکه پارزوونان و تۆربا،
تو بگوڤشه ئاڤ ژێ هەره، ب کێرێ قەلەم تراشێ دو دیلم که،

داماریێ گەزا و شەکر ژ ناڤ هەره.
ده خەرابۆ، ئەز ژ ته ره دبێم تو هەر شەڤا خوەدێ،
وەره ل سەر روونێ بخوه تەڤ مەگەرە.
.........(٣٩).

د چەند سترانان ژ بۆ سنیگتەڤتانەک و دەستپاشلکەکی قالا پارڤەکرن و نیڤیکرنا سینگ و بەران ژی تێ کرن:
کولمالێ، بانگێ ئەلەگەزێ
کولمالێ، بانگێ ئەلەگەزێ تێ فیکە-فیکە،
ده تو وەره تەلەبەختێ من ره،
فینۆ خارکه، قوتکێ سەردا سی که.
ئاگرێ کولێ بەیتا ئۆجاخێ باڤێ کەتێ،
وەره خال و خەتێ سینگ و بەرا،
من و دەواریێ مێریێ خوه نیڤی که(٤٠).

د سترانەکە ماییێن ده ژنەکە مێرکری باحسا «کلیتا جۆتێ مەمکان» دکە و کلیتێ تەسلیمی دلکەتییێ نوه دکە:

سەبرێ
........
لۆ لۆ تاخما سینگ و بەرێ من ژ ته ره،



یەک گول و یەک سۆسن و یەک چیچەکە،
تو تەڤی سێسەد سیوارێ مەحەسەنا لێ پەیابە،
بەرخۆ تو گولەکا خراب نەکە.
کۆتی میسکینێ مێرێ من، فەساد و دەووسێ گوندا خەبەردار نەکە.
ئەزێ کلیتا جۆتێ زەرمەمکا تەسلیمی تە کم، تو ل جێبا خوەکە،
بینا تە تەنگ دبە، رەبەنۆ رۆژێ جارەکێ دەری ڤەکە(٤١).

## ناڤکرنا فۆرمێن مەمکان

د سترانێن کوردی ده دەنگبێژ قالا مەمکان کرییە گەلەک تشتێن مایین ئانینە بەرچاڤان، وەک هەبوونا مەمکان و ڤان تشتان ل سەربنگەهێن مانتقی ئاڤاکرنە. د ناڤ ڤان پێڤانان دە تەحر، رەنگ و پرۆسەسێن گیهشتنا مەمکان جیهەکی فرەه دگرن.

**أ- تەحرێ مەمکان:** دەنگبێژ د گەلەک سترانان دە مەمک وەک فێکیان دیتییە و ناڤێ فێکیان ل مەمکان کرییە. چما فێکی؟ ئەز باوەر دکم ژ دەرگولۆ ڤەربوونا مەمکا و فێقیان، زێتر دەنگبێژ ئەو تام و لەزەتا دەمەکێ د فێقیان دە تان کرییە، د مەمکان دە ژ نووە ڤەکفش کرییە ئان ژی دخوازە کەفش بکە، ژ بەر ڤێ یەکێ ژی هەم گولۆڤەربوون و هەم ژی تام-لەزەتا مەمک و فێکیان د ڤان سترانان دە کەتنە ناڤ هەڤ. ئەو فێکییێن کو د سترانێن کوردی دە وەک مەمکان هاتنە پەژراندن و

نیشاندان وەک میسال ئەڤن: سێڤ، خورمە، تری، پۆرتەقال، هێژیر، گوز، قاون، هنار، شەمەمۆک، وەک میسال: مەمکێ خەزالا مالخراب سۆر بوونە/ مینا شەمۆکێت دەشتا هەسنا[٤٢]. ئانگۆری بەشێن کوردستانێ یێن جودا، جیهێ بەلاڤبوونا سترانان، ئەڤ دۆربەران ل سەر زێتر بکار ئانینا جۆرێ فێکیان ژی تەئسیر کرییە، وەک میسال د ناڤ کوردێن سورییێ دە، د ناڤ سترانەکێ دە دەرەباسبوونا «پۆرتەقالێ یافایێ» نۆرمالە، ژ بەر کو، نێزیکبوونا ڤان سینۆران ناڤدارییا پۆرتەقالێن ڤێ ناڤچێ ئەشکەرە کرییە:

.........

ل سەر زلفێ دانی،
خولامێ جۆتێ مەمکان،
پۆرتەقالێ یافایێ،
دەڤێ دکانا دانی.
...........[٤٣]

فێکییێن باشترین ل کیژان باژار، ناڤچە ئان ژی ل کیژان هەرێمێ دگهێژن، سترانبێژ ناڤێ ڤان جیهان و مەمک گیهاندەنە هەڤ، ب هەڤرا ب کار ئانینە:

عەلێ مەیرێ

........

ئەزێ سینگ و بەرێ مەیرەما خوە دبێژم
– خورمەک خورمێ ڤێ بەغدایێ،
هێژیرەک هێژیرێ ڤێ شەنگالێ،



تریک تریێ بسندرێ،
قاونەک قاونێ دیباربەکرێ،
خۆرت نزانبە، خوە رە بکە چەرەزێ شەڤبهێری
........[٤٤].

ژ دەر تام-لەزەتا فێکییان، ژ ئالییێ دن ئەو بینا خوەش یا کو ژفێکییان تێ، ڤێ چارێ دەنگبێژ چاوا کەفش دکە وەکی ژ مەمکان ژی بینەکە ئاوا خوەش تێ. د چەند سترانان دە ئەم راستی ئیفادیێن دەرهەقا بینا مەمکان تێن وەک: بینا مەمکا ئەم کوشتن، بینا مەمکا ئەم خوارن .... ژ بەر کو مەمک دبن کنجنا دە زێدە دمینن، ئەو خوەی ددن، وەک هێکان دسنجرن، گەرم دبن، د چەند سترانان دە ڤێ جارێ ئەم راستی ئیفادە «هلما مەمکان» تێن: هلما مەمکا ئەم خوارن. دەما ئەڤ بێن و هلما مەمکان تەڤ هەڤ دبە، چاوا ئەم دبینن دنیا بوویە یا دەنگبێژ.

دەنگبێژ مەمک نە تەنێ وەک فێکییان دیتییە، چاوا د چەند سترانان دە تێ خویان ناڤێ گەلەک تشتێن مایین ژی، ل مەمکان کرییە. دەما مەمک و ئەڤ تشت دانە بەر هەڤ، رووبەری هەڤ کرنە، بێشک وەکهەڤبوونا ڤان تشتان و مەمکان دایە بەرچاڤان، وەک کانی، کولیلک، باخچە-بۆستان، زێر-زیڤ، مادەن، فنجان ...

چییە نێزیکییا د ناڤبەرا کانی و مەمکان؟ ئەز باوەر دکم بەرسیڤا ڤێ پرسێ دچە دگهێژە وەکهەڤبوونا شیر و ئاڤێ، هەردویان ژی مرۆڤ ڤەدخوە، دەنگبێژ مەمک وەک جۆت کانی دیتییە، کانییێن کو ل شونا ئاڤێ شیر ژێ دکشن. ئاڤا ڤان کانییان ئاگر و شەواتا د دلێ سترانبێژ چقاس ددە سەکناندن؟ بەرسیڤا ڤێ پرسێ ژی دیسا د ناڤ فۆنکسیێۆنێن مەمکان یێن دووەمین دە ڤەشارتییە:

هەی لێ، لێ

هەی لێ، لێ، هەی قەمەرێ!
گوندێ دۆدۆ دو گەلی نە،
جۆتێ زەرمەمکا جۆت کانی نە،
وەێ مالینۆ، هوونێ قەت دەی ناکن،
ئەزی دەستێ چاڤ-بروویێ بەلەکا دمرم،
هوونێ باوەر ناکن[٤٥].

لێ گەورێ

.........
من سەرێ مەمکا گڤاشت
سێ فینجان ئاڤ ژێ هاتن خوار،
من فینجانەک ژێ ڤەخوار،
ئو ئەز بوومە وەک زیڤەئال
ئەز بوومە وەک مەرەکی تەیار.
........[٤٦].

د چەند ستران دە مەمک وەک فینجانان ب تایبەتی وەک فینجانێن فەرفووری هاتنە حەسباندن. ژ ئالیکی دە تەحرێ فینجانان (گلۆڤەربوونا وان، خوەشکبوونا وان)، ژ ئالییێ دن فۆنکسییۆنا (مۆتیفا ڤەخوارنێ) فینجانان و مەمکان ژ هەڤ نە دوورن. جار جار ئەم راستی ئیفادەیێن «فینجانێن دەست حاکمان[٤٧]»و «فینجانێ دەست ئاغەلەران[٤٨]» تێن. چاوا د ڤان ستران دە ژی تێ خویان، د سالێن کەڤن دە فینجانێن حاکم،



ئاغا و بەگان بوونە، ب سایا ڤێ گرانبها بوونێ سترانبێژ خوەستییە هێژابوونا، گرانبهاتییا مەمکێن دلکەتییا خوە ژێ نیشان بدە:

حەسرەتا من
..........
حەسرەتا من ژ مالا باڤێ دەرکەت،
ب من رە خەبەر نادە،
نزانم چرا؟
بەژن زراڤە مینا هال-هالێ ناف گەنمان،
مەمک سپی. مینانی فینجانێ دەست حاکمان.
- کەچێ، کولما ل باڤێ،
تە گۆشتێ من حەلاندییە،
ب واقی، ب دەرەما
هەستوویێ من حەلاندییە
کرییە شما
..........[٤٩].

سترانبێژ ژ بۆ کو بەدەوی و خوەشییا مەمکان ب تەحرەکی باشترین بینە زمێن، هەموو رێ و ئیمکانێن هونەری جەرباندنە، جارجار سینگ وەک باخچەکی، د ناڤ ڤی باخچەیی دە مەمک ژی وەک «باقێ گولان» ب ناڤ کرییە. د سترانا عەیشانێ دە ئاوا تێ گۆتن:

عەیشانێ
..........
سینگێ گەورێ باخچەیە، عەیشانێ،
باقێ گولا د ناڤدایە، عەیشانێ

.........(٥٠).

مرۆڤ ل ڤـرا باش تێدگـهێ كـو باقێ گـولان مـهمكن، د چهند سـترانێ كوردی ده جارجار پهیڤێن سینگ و مهمك ب ههڤرا تێن ب كار ئانین، د ڤان ستران دا سینگ وهك دهشت ، زۆزان، بۆستان و باخچهكی فرەهـ تێ نەخش كرن، مەمك ژی د ناڤ ڤی ئەردێ فرەهـ دە جیهـ دگرن. ل ڤرا ئێدی سینگ ل شونا مەمكان دەرباس نابن، ژ بەر كو قالا مەمكان خوە تێ كرن. لێ بەلێ جارنا ژی دەما قالا مەمكان نایێ كرن، مرۆڤ ڤێ چاخێ تێدگهێ كو پەیڤا سینگ مەمكان ئیفادە دكە.

**ب. رەنگێن مەمكان:** د ستران دە رەنگێ مەمكان ژ هەڤ جودا دبن. ژ ئالیـیێ دن بەشـێن مـەمكان (سـەری، بنی، خـالێن مـەمكان) ژی، ب رەنگێن جـودا جارنا تێن نیشـان كرن. د گـەلەك سـترانـان دە مـەمك وەك بەرفـا سـپی نە. سـەدەمـێن ڤێ یەكێ ئانگۆری بەشێ بەدەنێ یێن مـایین، مــەمك زێدە هاتنە پاراستن، روویێ رۆژێ نەدیتنە، زێدە سـپی مـانە، هەرچقـاس پەیڤا گـەور نە وەك پەیڤا سپی بە ژی، ل شـونا پەیڤـا سـپی جارجار ئەم راستی پەیڤا گەور ژی تێن. زێتر د سترانێن كوردی دە مەمك ب رەنگێ زەر هاتنە نیشاندن. دەما مەمك دگهێژن، ڤێ جارێ ئەم راستی پەیڤا سۆر تێنێ: مەمكێ خەزالا مـالخراب سۆر بوونە/ مینا شەمەمۆكێت دەشـتـا هەسـینا ... ئەڤ سـۆربوون ژ ئالیكی دە بۆنا سـەرێ مـەمـاكـان دەرباس دبە. دەما مەمك دگهێژن، خالێن ل دۆربەرێ سەرێ مەمكان چاوا تێ زانین رەنگ دگوهرین:

عەیشان

.......

تاخمێ سینگ و بەرێ عەیشانا من گیهشتنە،



خالێ سۆر و زەر كەتنێ(٥١).

ژ ئالیـیێ دن، د چەند سـترانـان دە سـترانبـێژ رەنگێ سـەرێ مـەمكان و بنێ مەمكان، كۆكا وان ژ هەڤ جودا كرییە، سەری ب تایبەتی سۆرە بنی و كـۆك ژی، ب تـایبـەتی ب رەنگێ زەر و سـپی ڤـە بۆیاغ كـرییـە، ژ تۆنـێن تاری بەر بێ تۆنێن ڤـەكـری چوویە. ب راسـتی ژی، ئانگۆری بن و كـۆكـا مـەمكان، سەرێ وان زێتر ب تۆنێن تاری نە، سۆر، قـاوەرەنگ و قەمەرن. سـترانبێژ ژ بۆ كـو ڤێ جوداتییا رەنگان زەلالتر ژ هەڤ جودا بكە، چاوا ئەم دبینن ژ خوە رە مۆتیفا سیـیێ پەیدا كرییە، چاوا تـێ زانین جیـهێ كـو سی لێ دكەڤە، ئانگۆری بەشێن مایین زێتر د ناڤ تارییێ دە دمینە، ئەڤ بەشا ژی سەرێ مەمكانە:

.........

كەزیزەرێ كەزی زەر،

خولاما مەمكێ گولۆڤەر،

سەری سۆرە، بنی زەر،

مینا بەرفا نەوالا،

سیبیا دارا تم ل سەر.

........(٥٢).

تشـتـەكی مـایین ژی هەیە، دەمـا د سـترانێن كوردی دە بەحسـا تەحر و رەنگێ مـەمكان تـێ كرن، مـەمك و تشـتـێن هەرە گـرانبـهـا د ناڤ هەڤـدا هاتنە هوناندنێ، وەك زێر، زیڤ، مادەن، فینجانێ فەرفووری ....

تێلی

تێلی حەیران، ل زۆزانێ سەرحەدێ دلێ من ب خەمە، ب برینە،

ئیشەڤ سەرێ برینێ من گرتییە تەمام ئاڤ و خونە،

مالا تیلییێ چوویە زۆزانێ تەڤلێ ژۆرینە،
هەسپی من رەوان بوویە، شۆپا تێلییێ د گەرینە،
کەتم پیرۆ، قەندیل، بینگۆلێ، سیپانێ، شەرەفدینێ،
بەر ب خەلاتێ، شوشانێ، تەکمانێ، هاتم وەلاتێ ژۆرینە،
م خوە بەردا بنیا کۆسەداخێ، چەند کۆن ڤەگرتینە،
سێ زەری من دی وێ دە سەرێ کانییێ روونشتینە،
من گۆ، گەلی هەڤال، یا مەزن تێلی یە،
هەردێ دن ژێ رە خزمەتچینە،
گشتا گۆ، دەرەوا مەکە، چاڤێ تە چاوا ژ دوورڤە دبینە،
من گۆ، نیشانێ تێلییا من بەللی نە
یەکە ئەسمەرە خوین شرینە،
چاڤێ رەشە کل کرینە،
تلییێ وێ ئارمووری نە،
چەنە تۆپ، پۆز بەلە توژینە،
لێڤ تەنک کاختینە،
زمان جەلخێ قەلەمینە،
درانێ هوورە سەدەفینە،
گەردەنێ سپینە جەمبەلینە.
مەمکێ تێلییێ فینجانێ فەرفوورینە،
سەرێ مەمکا تەمامێ زیڤێ چارجارینە،
کۆکا مەمکا تەمام زێرێ رەشادینە،
تێلی، ڤێ سبەنگێ ئەزێ تشتەکێ بێژم، بلا دلێ تە نەمینە،
قەدەرا کو بەرێ ژ باڤان دە هاتییە نڤیساندن تۆرەلینە،
چڤا زەرییێن مینا تێلی هەنە، پارا مێرکێ کۆتینە(٥٣).



## گیهشتنا مەمکان و سەرهلدانا وان

د ستـرانێن کوردی دە مەمکێن هەرە باشـترین مەمکێن کو ب حەمدێ خوە دگهـێژن، مەمکێن کو زێدە پێ نەهاتنە لیستن، مەمکێن هەرە جیـوانتر تێن حەسباندن. مەمکێن کو دەست پێ نەکتنە د ڤان ستranan دە مەمکێن کەچێن چاردە سـالی نە:«خوەزییا من تێ ل وی خۆرتێ/ د چاردە سالـییا خوە دە دەست باڤێژە جۆتێ زەرمەمکان». مەمکێن نووگیهشـتی، مەمکێن کـەچێن عـازەپخـانا ئانگۆری مـەمکێـن ژنێن مـێـرکـری و پرزارۆک گـەلەک هشـکن و ژ گـولۆڤـەربوونا خـوە تشـتـەک زێدە وندا نەکـرنە، تمێ گلۆک و گـولۆڤـەرمـانە. د چەند سـتـرانان دە ژ بۆ کـو ڤێ هشـکبـوون و سـەرتیـیـا مەمکان بینە زمێن، سترانبێژ مەمک وەک سێڤان دیتنە و پەیڤا «تەڕ» ب کـار ئانییـە، چاوا تێ زانین تشـتـێن تەڕ گەلەک هشکن، ناتەون، فـۆرمێ خوە ب جارەکێ وندا ناکن، وەک دارێن تەڕ:

........

تو ل کودا دچی یەک سەرییا ل من ڤەگەرە،
ئەڤ هەردو مەمکێن من مینا سێڤێن پاییزێ،
سەرێ دارا بمینە هێ تەڕە.
مالێ مە دانینە گوندێ ڤونتاری،
خوازگینچی ل مالا باڤێ من روونشتی،
قەلەندێ من دگۆت، خەلاتێ من دبری،
خزێما پۆزێ من مینا چەرخا فەلەکێ ل هەڤ دزڤری.
لاوکێ من بۆنا راموسانەکێ،

هاتە سەر سینگێ زەرییێ، شیر تونەبوو، دیسا پارا زڤری[٥٤].

د خەتا داوین یا ڤێ سترانێ دە دەرباسبوونا «شیر تونەبوو» بێگومان تونەبوونا مەرجێن هەڤدودیتنێ ئان ژی ڤێ رەوشا نەباش نیشان ددە.

مەمکێن کو د وەختێ خوە دە دگهێژن، د سترانێن کوردی دە وەک ئاڤاهیکێ، کۆشک-سەراکە رۆژ ب رۆژ بلند دبە، هاتنە حەسباندن، ئیفادا «تاخمێ مەمکان» پچەکێ ژی، مرۆڤ دکارە بێژە کو ل سەر ڤێ سازییێ هاتییە ئەفراندن:

خەرابۆ

...........

سەرێ مەمکێ من خاتوونێ،
مینا ترییێ چیلێکێ عەلییێ رەمۆ
د چاخ و بەنگا خوە دە دگهییا،
ئو د مێوا خوە دە دکەملی،
مینا قەسرا پیرۆتا،
سەرێ محەلا مەشکینا،
ل باژارێ مێردینێ ئاڤاکری[٥٥].

مەزنبوون و گهیشتنا مەمکان د سترانێن کوردی دە وەک «سەرهلدانا مەمکان» هاتییە حەسباندن. مەمک، چاوا تێ زانین د کۆنتاکت و نێزیکییا بەدەنی دە تەئسیرەکە گەلەک زوو نیشان ددن، ب تایبەتی سەرێ مەمکان گەلەک ژیندارن: سەرێ مەمکێ تە تووژن/ وەکە سەرێ دەرزییا[٥٦].



گولێ گولێ

.........

دەستێ خوە کر پاشلێ،
چ پاشلەک خوەیدایی،
سەرێ مەمکان هلدایە،
مەمک پارا خۆرتایە..
..........[٥٧].

ئەڤ سەرهلدانا مەمکان چاوا ئەم دبینن د چەند سترانێن کوردی دە، ب سەرێ خوە بوویەرەک هاتییە حەسباندن، مەمک سلاڤان ددن، دەنگ دکن و ب لەز-بەز رەنگ دگوهرینن، سۆز-زەر دبن...

ئەمان، ئەمان دۆتمام

..........

ڤی کەری پەزێ چەندی ڤایە،
نێرییێ ناڤ دە نۆتلا گایە،
لاوکێ من قەستا سینگ بەرێ من کرییە،
جۆتێ مەمکان ژێ رە سلاڤ دایە[٥٨].

دلیبەر

.........

جۆتێ مەمکێ م کەچکێ، مینا دو کەوێ گۆزەل،
ب سارییا سبەهێ رە،
ل پاشلکا م کەچکێ دکن شێرە-شێرۆ[٥٩].

مەمکێن کەچێن نووگیهشتی ئان ژی مەمکێن کو زێدە نەبوونە «دەستمالا دەست خۆرتان» چاوا مە ل ژۆرێ ژی گۆتبوو هشک و گولۆڤەرن، وەک سێڤەکێ نە: مەمکێ دۆستا من سێڤێ سۆرن/ هێدی بدنە بەر وان گەزانە[٦٠]. چاوا تێ زانین تشتێ هشک و سەرتێن گەزکرنێ، ژ بەر ڤێ یەکێ ژی دەنگبێژ مەمک و سێڤ وەکهەڤ دیتیيە، ئان ژی تشتەکی مایین ئانیيە ل بەر چاڤێن خوە: سینگێ ڤێ تەرەسباڤێ هشک بوو/ مینا حەلاوا ئەنتابێ/ ب چاکوچ و تەڤشۆیێ/ دەستێ نە جاران و مەرەنگۆزان نە دکشییا[٦١]. ژ ئالییێ دن دەنگبێژ وەک فێکییێ کو دگهێژە و ژ چقلێ دارێ دکەڤە، دەما گیهشتنا مەمکان ژی تەسپیت کرییە:

بەدەوێ

...........

گریداخا بەر ب دونێ،

سورەت سۆربوونە خال کەتنێ،

پار ڤی چاخی مەمکێ کەوا من تونەبوو،

ئیسال ڤی چاخی هاتنە بەر کەتنێ.

...........[٦٢].

د هن سترانان دە وەک کولیلک، گوپلێن داران چاوا ڤە دبن، مەمک ژی وسان دبشکڤن ئان ژی دپەقن. دەما مەمک مەزن دبن، ئەو دکارێن ئانگۆری دەنگبێژ کراسێن کەچا ژی بدڕینن:

... مەمکێ تە ل دو جی کراسی ددڕی[٦٣].



## گوهاستنا فۆرمێ مەمکان

ئەو بەدەوی، گولۆڤەربوون، هشکبوون و رەنگینییا مەمکان چاوا ئەم دبینن د چەند سترانێن دەوندا دبن. د ڤان ستران دە ئەم راستی پەیڤێن مزدان، تەڤدان، گەزکرن، گڤاشتنێ تێن، پڕانییا ڤان ستران ژ دەڤێ مێران دەردکەڤن. ئەڤ یەکا ژی نیشان ددە، مێر ل دژی گوهڕینا فۆرمی مەمکان نەرازیبوونا خوە ل هەمبەری ژنێ نیشان ددە: مەمکێ ڤێ تۆلباڤێ سستبوونە ژ مزدانێ[٦٤]. ئان ژی چاوا د سترانەکە مایین دە تێ خویان ڤێ جارێ مێر ژ زێدە تەڤدانا مەمکان گازنێ خوە دکە: ئەزێ ئۆرتا سینگ و بەرێ کەوا خوە دنێرم/ گشتە خرتە-خالە ب نیشانا تەڤدانێ[٦٥]. جارجار ژی چاوا ئەم دبینن ژ بەر چەند سەدەمان وەک ژ هەڤ دوورکەتن و دلسارییێ مەمکێن ژنێ «بێ تیمار» دمینن:

سێ مالۆ گوندۆ

ئەز چوومە دەرێ چەمان، چەمێ سارن،

زۆزانێ باڤێ تە بلندن،

بەرف و باران لێ دبارن،

ئیسال سالا هەفتایە،

بەرێ لاوکێ من کەتییە،

وەلاتێ غەریب و غوربەتێ،

سینگێ و بەرێ من فادلێ!

بێ مهاس و بێ تیمارن.

یار، یار یارخۆپانۆ گوندۆ

..........[٦٦].

ژ بەر تەڤدان، مزدان و گەزان ئان ژی سەدەمێن مایین چاوا تێ خویان د ڤـان سـترانان دە مـەمک ئێـدی وەک مـەمکێن کـەڤنەژنان ژ هەڤ چوونە، وەک گـۆشـتێ کـەلاخن، چلمـسـینە و ڤێ رەوشێ بالا دەنگبـێـژ گـەلەک کشاندییە.

## دزێن مەمکان و موجیزەیا ڤەبوونا بشکۆکان

د ناڤ سترانێن کو ل سەر مەمکان دە هاتنە گۆتنێ، پەیڤا کو زێتر بالا مـرۆڤـان دکـشـینە، بێگومـان پەیڤـا بشکۆکـە. چ پێـوەندییـێن مـەمک و بشکۆکـان هەنە؟ د سـەردەمـێن کـەڤـن دە ژنێن کـورد مـەمکێن خـوە ب پێـسـیردانک (بەرپێـسـیر، چچکبەند) نە دپاراستن، تەنێ مەمکێن خوە د بن کنجـێن بشکۆککری دە ڤـەدشـارتن، لێ بەلێ دیسـا ژی ریسـکێ خـویا بوونا مـەمکان هەرتم زێتـر بوو. ژ بەرڤـان سـەدەمـان د گـەلەک سـتـرانان دە مۆتیفا بشکۆکان وەک مۆتیفەکە شیر-دەو دەرباس دبە. ژ ئالییێ مێران دە کێمبوون ئان ژی تونە بوونا بشکۆکان شاهیکە هەرە مەزن هاتییە حەسبین. د سترانان دە ئەم راستی ڤەکرنا بشکۆکان (ب دەستێ مێران) نایێن. ئەڤ یەکا ژی نیـشـان ددە کـو تەنێ ئیـرادا مـێـران رۆلەکە ئەوقـاس مـەزن نالیـزە. داخوازا ژنێ زێتر گرنگترە. ژ بەر هەڤدو فـامکرن و هەڤدو حەزکرنێ چاوا ئەم دبینن بشکۆکێن پێـسـیـران جار نا ب خـوە ژی ڤە دبن: دەمـا بشکۆک ڤـەدبن، مـەمک ب خـوە دفـرن دەرڤـا. د بن ڤـەبوونا ڤـان بشکۆکـان دە بێگومـان داخـواز و ئەڤـینا ژنێ رۆلەکـە مـەزن دلیـزە. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی دزێن مەمکان هەرتم ناگهێژن ئارمانج و خوازییێن خوە.

ژنا هەبوونا مـەمکێـن خوە ئانـگۆری مەمکێن مێـران (یێن کـۆربوویی، شوندا مایی) هەرتم وەک سـەردەسـتـیکە مـەزن دیتـیـیـە. بۆ ڤێ یەکێ ژی پاراستنا مـەمکێن خوە و پرسا پێشکێشکرنا وان، د ڤان سترانێن لیریکی دە جیهەکی فرەهـ دگرە.

ئانگۆری داخـوازی ئان ژی بێـدلیـیـا ژنێ دەمـێـن ڤەبوون/ پەڤـخـسـتنا بشـکـۆکـان ژ هەڤ جـودا دبـن. برپار دیسـا د دەسـتێ ژنان دەیە. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی دزێ مەمکان هەرتم ب هێسانی ناگهێژن ئارمانجێن خوە: ئەزێ دکم هەرم دزییا جۆتێ زەر مەمکان/ دەستێ من کەتە مۆرییێ لنگان[٦٧]. دزێن مـەمکان هەر رێ و ئیـمکانان دەجـەربینن وەکی خـوە بگهـێنن جـۆتێ مەمکان:

ئای ئای ل من، کوبارێ دینێ!
دەرێ مەشکینا خۆپان ب شەوتی، نە تو دەرە،
پۆزێ کەلا مێردینێ بشەوتی، تم راسەرە.
خوەزییا ئەز بیووما زێرەکی مەحموودی،
ژ خانبۆخازا قرکێ خوە بەردا،
ناڤا جۆتێ سینگ و بەرا!
سینگ و بەرێ خەلکا تێلی کالە بۆزە سپی نە،
مینا باخچەکێ سولتان عەڤلحەمید
ب شەڤ و رۆژێ قەرەقۆل و نەوبەت تم ل بەرتێ!
دە ئای ئاخ ل من، ئۆف ئۆف ل من!
دە ئاخ ئاخ ل من، تەنگەزارم خوە دێوۆ[٦٨].

لێ دەما ژنەکێ دل کر، وێ چاخێ بشکۆک ئێدی خوە ڤەدبن. چما خوە ڤە دبن؟ ژ ناڤەرۆکا سترانان ئەم فام دکن کو، ئێدی هەرتشت ب حەمدی خوە، ب قامێ خوە دمەشە، دو دل بوونە یەک، دەما دو کەسان هەڤ حەز

کر، بێگومان بشکۆک ئێدی خوە ڤە دبن، کەس پشکۆکان ڤەناکە، د ڤان سترانان دە بشکۆک یا دقەتن، یا دفلتن ...! چاتییا لێکەران (ڤەرب) تمێ پاسیفن، ئەڤ هلبژارتنا گراماتیکی، ژ ئالیکی دە. رۆلا زۆرێ ژ ئۆرتێ رادکە. چاوا د سترانەکێ دە تێ دییار کرن ئێدی «سی و شەش بشکۆکێن زیڤین» هاتنە ڤەکرنێ، کێ ڤەکرنە؟ ئەڤ یەک نایێ زانین وەک موجیزەکێ ئەڤینێ تێ خویان:

دەلالۆ، م بێری کر، تە بێری کر،
رییا مەندارا شەوتی ل نەوالێ مە ل هەڤ هێڤی کر
بشکۆکێ م رەبەنێ خوەدێ فلتی، سینگا گەور سپی کر[٦٩].

ڤی زناری ل مە سی کر
بشکۆک قەتییا، سینگ سپی کر،
عەمرێ منی سەد سالی هەبوو،
منێ تە رە تەڤ نیڤی کر [٧٠].

د سترانێن زەری دۆمامێ و مەردینێ دە چاوا ئەم دبینن د ناڤبەرا لاوک و کەچکەکێ دە ل سەر مەمکان تێ دەنگ دکن، شەڕ-دەوەک هەیە، دیتنێن جودا داڤێژن بەر هەڤ. ئانگۆری ناڤەرۆکا ڤان سترانێن درێژ، میسال وەک سترانا زەری دۆمامێ، دەما کەچ پەی مییێن خوە دچە، ئەردێ دکەڤە «سێسەد و شێست و شەش بشکۆکێن» کەچکێ دقەتن، لاوک وێ چاخێ مەمکێن کەچکێ دبینە. لێ بەلێ جارا پێشین کەچک ڤان باوەری و دیتنێن لاوک قەبوول ناکە، خوە ل دژی ڤان «ئیفتیران»و «بێبەختییان» دپارێزەو ژ لاوک دپرسە:



زەری دۆمامێ
کورۆ کولمالۆ، یا بێبەختی سەردا هاتۆ،
تە وەختێ سەرێ زەرمەمکێ دینە،
ناڤ و نیشانێ وان چییە، چ نینە؟
.........
– کورۆ کولمالۆ، تە وەختا چفتە زەر مەمکێ منە زەر
دیبوون شەدە، شودێ تە کی، کی بوون؟
..........

پاشێ د ناڤبەرا کەچ و خۆرت دە ئەڤ دییالۆگا ژێرین دەرباس دبە. کەچک د داوییێ دە تێدگەهێ کو ب راستی لاوک مەمکێ وێ دیتنە، کەسەکی ناسە:

– کەچێ، کولمالێ، وەختێ من چفتە زەرمەمکێ تە زەر دیبوون،
نەهـ هەبە ل وێدەرێ هەزرە سەکنیبوون:
سێ هەڤە جەلالی بوون،
سێ هەڤە رۆژەکی بوون
سسێیە سیپکی بوون.
– کورۆ، کولمالۆ، هەرسێکی جەلالی قاچاخێ چیبابوون،
هەرسێکێ رۆژەکییە ڤرەکە دەرەوین بوون،
هەرسێکە سیپکی رازگۆنە، جینارێ مالا باڤێ من بوون،
وسانە تە چفتە زەرمەمکێ من زەر دینە
.........[٧١].

هەم د سترانا زەری دۆمامێ دە، هەم ژی د سترانا مەردینێ دە چاوا تێ خویان ب راستی لاوکان مەمکێن ڤان کەچکان دیتنە، ژ بەر ڤێ یەکێ ژی

کەچک جۆتێ زەر مەمکان خوە پێشکێشی «حەلالییێ جانێ خوە» دکە. چاوا د سترانەکە مایین دە ژی تێ خویان، هەرتم کلیت د دەستێ ژنێ دایە: هەگەر تو پرسا کلیتا جهێ مەمکێن دکی/ قفل و مفتە دەستێ منە[٧٢]. د گەلەک سترانان دە بەری کو بشکۆک ڤەبن، جارا پێشین دەست ل سەر مۆری و زێرێن ل ستوو-گەردەنێ تێن-دچن، هەرچقاس فۆنکسیونا مۆری-مرجان و زێران جودا بە ژی، د هەر سینگتەڤدانەکێ دە ئەو تێن قەتاندن. ب کورتی د سترانێن کوردی یێن ئەڤینێ دە مۆری-مرجان، زێر-زیڤێن گەردەنێ و بشکۆک وەک مۆتیف، بەدەویکە مەزن پێک تینن، خەمل-نەخشەکە بێهەمپا ددن ڤان سترانان.

دەما ژنەک دل ناکە یەک دەست باڤێژە جۆتێ مەمکان ئێدی دەرگە تێن گرتن. ژنا کورد د ڤی واری دە گەلەک سەرهشکە، گاڤەکێ پاشتا ناڤێژە. دەما زین ژ سەر مەمێ رە تو کەسەکی ناحەبینە، هەفت دەرگەهێ مالا باڤێ وێ یێن پۆلا تمێ گرتی دمینن:

مەمێ و زینێ
زینێ گۆت:
- هەفت دەرگێ مالا باڤێ من، هەفت ژی پۆلا نە،
تەمام قەرەباشی پەلەوانە،
هەڤێ باڤێ کێ هەیە،
ڤێ ئێڤارێ دەڤێ خوە بگهینە خالا سینگ و بەرانە.
..........[٧٣].

هەرتم نە تەنێ مێر ل پەی ژنانن، جارنا ژی ژن پەی مێرانن، قایدە قانوونان داڤێژن ئالیکی. ئانگۆری عەرف-عەدەتێن کوردان ئەڤ ژنان، خۆرتخاپینۆک، «ژنێن ناف مالان» تێن ب ناڤکرن. د دەستانا زەمبیل



فرۆش دە، دەما خاتوون دل دکە وەکی زەمبیل فرۆش ببە دۆستێ وێ زەمبیل فرۆش ڤێ یەکێ ناخوازە، لێ دیسا ژی ئەڤ خاتوونا دەولەمەند، خۆرتخاپینۆک و پرۆڤاکاتیف سینگ و بەرێ خوە ڤەدکە، دخوازە وی ژ رێ دەرخە: .... دەری دادایە/ سەر سینگ و بەرێ خوە ڤەدەیا[٧٤]. دەما ژنەک سینگ و بەرێ خوە یەکتەن، نێشکێڤا ل پیشبەری مێرەکی ڤەکە، بێگومان ئەڤ تابلۆیا نووپێکهاتی دکارە هش و مێژوویێ سترانبێژ تەڤلیهەڤ بکە، چۆکێن سترانبێژ بلەرزینە، وان وەلات وەلات بگەرینە:

سینەم دەلالێ چاخێ من و تە،
ل چەمێ میرا ل هەڤ سەیران کر،
من سەرێ خوە دانێ بوو ل سەر چۆکا ژێلیل،
تەماشەیی خالان و بسکان کر.
دەما چاڤێ من ل سینگ و بەرێ سینەما من دکەتن،
مسر، بەیروت و شامێ تێرا خویا کر[٧٥].

## جەنگێ ل سەر مەمکان

د چەند سترانان دە ژنا کورد زێدە بوونا هەژمارێن دلکەتییان وەک تەلوکەکە ل دژی مەمکێن خوە دیتییە، ل دژی ڤان ئێریشان پاراستنا مەمکێن خوە دهن سترانان دە دکە پرسەکە سەرەکە. ل سەر مەمکان جەنگێ میران، وەک ئێریشێن پۆلیتیک ب ناڤ کرییە، جارجار ژی رەوشا کوردستانێ و ئەڤ ئێریشێن ل دژی مەمکان رووربەری هەڤ کرییە. جەنگێ ل سەر کوردستانێ وەک جەنگێ لسەر مەمکێن خوە دیتییە. ئەڤ مۆتیفێن پۆلیتیک و ئەڤینێ د ڤان سترانان دە کەتنە زکێ هەڤ:

بەژنا من
بەژنا من، نازکە، تا رحانا شەنگە،
شوورەتێ من ئوسا نە، نۆتلا هەرمووشێ پەنگە،
سینگ و بەرێ من ئوسا نن،
نۆتلا تەخت و پایێ کوردستانێ،
ئیسال هەفت سالە، دانزدەهـ قرالا ل سەر قال و جەنگە(٧٦).

د سترانەکە مایین دە ژی، دەما ل سەر مەمکان تێ سەکنین، ئەم راستی ئیـفـادەکـە وەک ڤێ ئێـفـادێ تێن: ...... ناوەللەهـ نۆلا سـولـتـان رەشـیـد، شەرت و قاییشێ هەفت دووەلێ ئەجنەبی ل سەرە .... د ڤان ستranان دە دەرباسبوونا ڤان ئێفادەیێن پۆلیتیک و دیرۆکی رەنگەکێ گەلەک هونەری تەڤی ڤان ستranان دکە. ژ ئالیکی دە ژی، ژنێ هەم هەبوونا خوە یا ژنین و هەم ژی تەلوکەیێن ل دژی هەبوونا وەلاتێ خوە خواستییە بینە زمێن. د سـتـرانەکـە مـایین دە، سـتـرانبـێـژا ژنین هێـژا بوونا مـەمکێن خـوە وەک«پایتەختێ میرێ کوردستانێ» دبینە:

دەردۆ
کورۆ م ژ تە رە نەگۆ
زمانێ تە قەلەمە، سینگێ م دەفتەرە،
سەرێ سبەهێ، میناکیی مەلایێ دوانزدە عەلیم،
تو دخوینی ل ئەزبەرە
سینگ و بەرێ م ئەتیما خوەدێ،
مینانی پایتەختێ کوردستانێ،
سالێ دوانزدە مەهـ،
شەڕ و قەوخەیێ دوانزدە،
دەولەتێ ئەجنەبی، دایم ل سەرە(٧٧).



## چەند مۆتیفێن دینی و مەمک

ژ دەر مـۆتیـفـێن پۆلیـتـیـک، د چەند سـتـرانـان دە هن مـۆتیـفـێن دینی (ئۆلی) ژی، ب تـەمـا مـەمکان ڤـە تەڤـایی دەرباس دبن. ژنا کـورد د ڤـان ستranان دە زێتر پەسنێ مەمکێن خوە ددە، ب ئالیکارییا ئیفادەیێن دینی «ئەدەبییاتەکە مـەمکان» د ئافرینە، د ڤان سـترانان دە وەک میـسـال ئەم راستی ئیـفادەیێن فـتر، زەکات، مەلەک، خوەدێ، رۆژی، پاشیف، حەج، تەبەرک، شێخ-مەلە، مەککە .... تێن ژ بەر کو د ناڤ هەر جڤاتەکێ دە بیـر-باوەری، مـۆتیف-نەخشـێن ئۆلپـەرەستـی (دینی) تمێ ب روومـەت بوونە، سـترانبـێـژ خـواسـتـیـیـە ژ ڤێ روومـەتێ بەهرەکێ گـرێ بدە، ژێ ئیسـتیفادە بکە. لێ بەلێ چاوا ئەم دبینن، سترانبێژ هێژابوون و گرانبـهایی یا مەمکان ل سەر ڤان خەملێن ئۆلپەرستی رە گرتییە، جیهەکی هن ژی روومەتتر دایە مەمکان. د ڤان سترانان دە مەمک بوونە زێر-زیڤ، مادەن و وەک بهوشتەکە دەرەوین، رەنگین و شەنگە شۆخ بن:

.........
وەللە سینگ و بەرێ من ئەڤدالا خوەدێ،
مینانێ باخچەکی زنارا مێردینێ،
سەرێ سالێ سێ جارا زەکاتێ مالا خوەدێ لێ دکەڤە،
لۆ!
.........(٧٨).

د سترانەکە مایین دە یا کو ئەڤـینا ل سەر کەچەکە ترک تێدا دەرباس دبە، مەمک وەک فتارا ئێڤارێ هاتییە ب ناڤکرن:

کەچی دینێ

.........

لێ گەورێ، لێ خەزالێ،
کانی رندا ناڤ مالێ،
وەیلا م مەمک خوارێ،
مەمک فتارا ئێڤارێ،
کەچێ دینێ تو زانی،
تە ئەز کوشتم، تە ئەز حەلاندم،
تو بکورمانجی نزانی،
ئاسکر ئولدوم پەیادە،
تەلیم بلمەم نە چارە.
.........[٧٩].

د سترانا دن دە ژی، چاوا ئەم دبینن ڤێ جارێ ل سەر مەمکێ عەیشێ «جۆتەک مەلەک» د خوینن[٨٠]. دەما مەمک تێن خویانێ موجیزەیێن نەدیتی، بوویەرێن نەهێڤیکری دکارن پەیدا بن، مەمک دبن بایسێ ئنتەرمەززۆییێن نووە، وەک «ئەگەر ڤەکم بشکۆکێ سینگ و بەرۆکێ مەمکان/ حەجییێ ڤەگەڕن ژ رییا مەکانە[٨١]»، «ئەگەر هوون بشکۆکێد سینگ و بەرۆکان ڤەکن/ وێ میرییێن گۆڕا زێندی بکن[٨٢]». دەما مەمک ڤەدبن، سترانبێژ ژ خوەدێ رە حورمەتان دشینە و شکران دکە:سینگ و بەرێ وێ گولبارانە/ ئەزێ بیهن کم، ژ خودا بکم شکرانە[٨٣]. د سترانەکە ماینی دە، مۆتیفێن ئۆلپەرەستی و تەما مەمکان ب تەمامی کەتنە زکێ هەڤ:

وەرە مالا باڤێ من دەری ڤەکە، بێ بسملا،
گاڤا تو کەتی جەم من، تە لهێڤ بلندکر،
بێ یا رەبی، سەد ماساللا،
دە گاڤا دەڤێ خوە ئاڤێت خەبخەبا چیناخی،
قرکا منی پۆشناقی،
تە دەفێ خوە قرکا من دەرئانی، بێ یا رەببی، حەمدوللا،
سینگ و بەرێ من تە رە بۆزی–بەیازی،
مینا بەیار کاختا دەستێ خۆجە و مەلا[٨٤].

چاوا د سترانەکە ماینی دە ژی ئەم دبینن، ڤێ جارێ جۆتێ مەمکان ژ بۆ خێر –خوەشییێ بینە، بۆنا دەرگەکی خێرێ ل پێشییا خێرخوازان ڤەکە، وەک تەبەررک تێ پێشکێش کرن:

دە گیدیانۆ
.......
دە گدیانۆ! دە گدیانۆ!
ناڤبەینا من و بەژنا زراڤ ب دیوارە،
ئالی کلس، یەک نکارە.
جۆتێ مەمکێ من خانم خاتوونێ،
یەک سێڤ، یەک پۆرتەقالە.
کەچکێ گازی دکر دگۆ: لۆ ... لۆ لاوکۆ،
شەڤکێ ژ نیڤبەندا شەڤا و پێ ڤە،
وەرە تەوافا سینگ و بەرێ من کەچکێ،
ژ تە رە خوەشترە،
ژ تەبەرکا مالا شێخێ کالە.

ژ گرێدانا پشتێ بەر ژۆر دە،
تو چ دخوازی ئەز منێکارم،
ژ گرێدانا پشتێ و بەر ژێرە دە،
ئەز مریدا شێخێ کالم،
چ بخوازی ئەز نکارم [٨٥].

د داوییا ڤێ سترانێ دە، تشتەکی گەلەک بالکێش ژی، کەچک بەدەنا خوە ژ پشتی (ناڤێ) ڤە دکە دو بەشا: بەشا ژۆر، بەشا ژێر، د ناڤبەرا هەردو بەشان دە بەسا گرێدانەکێ ژی دکە، بەشێ ژۆر سینگ و بەر تەڤ دە پێشکێشی لاوکێ خوە دکە، بەشا ژێر تەحرەکی گەلەک نازک پەردە دکە. ئەڤ یەکا ژی نیشان ددە کو، د سترانێن کوردی دە ناڤچا هەرە ئەرۆتیک مەمکن، ژ ناڤێ بەر ب ژۆر. موتیڤێن ل سەر بەشێن بەدەنێ یێن مایین (ژ ناڤێ بەر ب ژێر) وەک ناڤچێن ئەرۆتیک ئەوقاس بالکێش نینن.

## پەیدابوونا تەما «ژنێن مەمکفرۆش»

تەما «ژنێن مەمکفرۆش» زێتر د ناڤ سترانێن کو ژ دەڤێ مێران دەرکەتی، جیە دگرە. مێرێن کو ئەڤینداربوونە هەرتم چاوا د ڤان ستران دە تێ خویان، نەگیهشتنە داخوازێن خوە، هێڤییێن وان نەهاتنە جیە. ژ بەر ڤێ یەکێ ژی، ڤان مێران د هەمبێزا خەم-خەیالان دە ژ خوە رە ئیمکان و مەجالێن نووە پەیدا کرنە، وان د زەریا خەونەرۆژان دە ب تەحرەکی هونەری ئاڤژەنی کرنە، چوونە-هاتنە، بۆنا کو ژ خوە رە جۆتە مەمک دەست بخن. ئەم د چەند سترانان دە راستی پەیڤێن دکان، سوک-بازار، مشتەری، کرین-فرۆتانێ ... تێن. ژ بەر چەند دژواری، بێگاڤی و بێمەجالییێن ژیینێ، سترانبێژ خوە ئاڤێتییە بەر بەختێ خەم-خەیالان. د



ڤان سترانان دە کەچ هەرتم د رۆلا مەمکفرۆشەک، خۆرت ژی رۆلا مشتەریکی دەیە:

حەلیمجانێ
دە ب جان بە، حەلیمجانێ
ئێ لێ حەلیمجانێ،
حەیران ئەز نە تی مە،
ئو ئەز نە برچی مە،
ئەز ل بەر سیهکا بتلیسا خۆیان روونشتیمە.
ئێ لێ حەلیمجانێ،
هەکە تو ئاڤکشێنی، ئەز گەلەک تی مە،
هەکە تو نانپێژی، ئەز گەلەک برچی مە،
هەکە تو سینگفرۆشی، ئەز مشتەری مە
هەکە تو نافرۆشی،
رۆژ هزورا هەق،
ئەزێ ل سەر پەلا سەلاتێ،
دەستێ من و دەواتە
ئەزێ ل حەلیمجانا خوە دە، وەچی مە.
........[٨٦].

د ڤان سترانان دە دەرباسبوونا پەیڤێن سینگفرۆش-مشتەری، ژ ئالیکی دە ئەڤینداریا مێر چقاس ب شەواتە، گەلەک باش ئەشکەرە دکە. بێگومان ئەڤ پەیڤان ژ کرینا مەمکان زێتر، دەستخستنا مەمکان ئیفادە دکن، ب گۆتنەکە مایین هێڤییێن هەڤدودیتنێ، ئەڤینێ ئەشکەرە دکن، ل ڤرا مرۆڤ نکارە پێوەندییێن ئەکۆنۆمیک-بازرگانی بینە بیرا خوە، وەک میسال:- کەوا من مەشییا دکانێ/ مەمک برن فرۆتانێ[٨٧]. د ڤێ

سترانێ ده تشتێ مرۆڤ ژێ دەردخە نەکرین-فرۆتانا مەمکانە، مەبەست هێڤییا دەستخستنا مەمکانە، تەنێ د ناڤ سینۆرێ داخوازەکێ دە دمینە.

چاوا مە بەرێ ژی گۆتبوو، دەنگبێژ د ناڤبەرا فێکی-ئێمیش و مەمکان دە تو جوداییەک نە دیتییە، وەک پاشل تژی ئێمیشە[٨٨]. ڤرا پەیڤا ئێمیش ل شونا مەمک هاتییە ب کار ئانین، جییێ کو فێکی-ئێمیش ل تێ کرین و فرۆتانێ، ئانگۆری دەنگبێژێ مێرین و فانتازییێن وی، ل ورا مرۆڤ دکارە مەمکان ژی، ژ خوە رە پەیدا بکە، ژ بەر ڤێ یەکێ ژی پەی رییا سووکێ (بازارێ) کەتییە و ژ کەچکێ پرس کرییە: زەر مەمکا نافرۆشی؟[٨٩].

ژ بۆ کرینا مەمکان چ ژ دەستێ مێر تێ، ددە، یەک-دو نابێژە، تماتی و چکووسییێ داڤێ ئالیکی:

سەیران

........

سەیرانێ، من خولاما تە ل وی دەڤی،<br>
گوندۆ، لۆ مالینۆ، ئەزێ بەختێ وە کەتمە،<br>
گازن-لۆما ژ من نەکن،<br>
ئەزێ تەرکا چاڤ-برووێ سەیرانا مەلە موسا ناکم.<br>
هەتانی سەرێ قەرەشداغا خۆپان،<br>
رانەبە مێرگ و زەڤی.<br>
سەیرانێ منێ سۆند خارییە-<br>
گەرە سوورەتێ تە سۆر بدم بەر ڤی دەڤی<br>
سەیرانێ من خولامێ تە وی دەڤی، خەبەردانێ،<br>
گوندۆ، لۆ مالینۆ، ئەزێ بەختێ وە کەتمە،<br>
هوونێ گازن-لۆما من نەکن،



مەمکێ سەیرانا من وسانن:<br>
سەری سۆرن کۆکێ وان سپی نە،<br>
نۆتلی سێڤێد خەلاتی نە،<br>
نۆتلی خورمێ عەرەبی نە،<br>
نا وەللە، نۆتلی ترییێ رەوانێ سنجرینە،<br>
وێ ئانینە هەفا مالا فرۆتانێ،<br>
هەرکە خەلقێ رابە بدە مال-حالێ دنێ،<br>
ئەز سێفیلێ خادێ رابم بدم،<br>
هەرچار منگێ خوە تێن بەر دۆتنێ،<br>
دە باڤێ، سەیران خەیدییە ب من رە نایێ<br>
.........[٩٠].

گەلەک جاران مەمک د سترانان دە وەک سێڤێن فرۆتانێ هاتنە نیشاندن. چاوا مە ل ژۆر ژی گۆتبوو، هەم ژ ئالییێ تەحر، تام-لەزەت و هشکییا خوە ڤە، درووڤێ مەمکان ئانگۆری دەنگبێژ گەلەک ل سێڤان کەتییە، وەک هەڤ هاتنە حەسبین. ئەو بەدحالێ کو جۆتێ مەمکان وەک دەرمان دیتییە، چاوا د سترانەکێ تێ خویان، دیسا رییا دکانێ دگەرە:

....... مەمک سێڤە ل دکانێ[٩١].

ب کورتی مرۆڤ دکارە بێژە، د هەموو ڤان سترانان دە ئەڤ مۆتیفێن ل دۆرا تەما مەمکان بەرەڤ دبن، نیشان ددن کو، مەمک ب سالان وەک نیشانەکە مەزن یا شاخسییەتا ژنان هاتییە پەژراندن. ب کێمانی ئەڤ ماتەرییالێن فۆلکلۆریک ڤێ راستییێ ژ مە رە پێشکێش دکن. ژ ئالییێ دن ل سەر ژیینا سەکسوەل یا ژنێن کورد، سبێ، د پێشەرۆژێ دە، ئەڤ سترانان وەک رەفەرانس دکارن گەلەک زانییارییێن کێرهاتی رابەری مە بکن.

## چاڤکانی


١- رۆژا نوو، هەژمار:٢٧ . ئەڤ کۆڤارا کو ب کوردی و ب فرانسی دو زمانان هاتییە وەشاندن، د ناڤبەرا سالێن ١٩٤٣-١٩٤٦ ل بەیرووتێ دەرکەتییە، چاپا نوو: ئوپسالا، ١٩٨٦ .

٢- حەجییێ جندی، کلامێد جماعەتا کوردایە لیریکییێ، ئەریڤان، ١٩٧٢، رووپ. ٣٩ .

٣- ئەحمەدێ خانی، مەم و زین، ئەستەنبۆل (وەرگەر: م. ئە. بۆزئەرسلان) ١٩٧٥، رووپ. ١٩٣ ، ١٠٨ .

٤- حەجییێ جندی، مەسەلە و خەبەرۆکێد جماعەتا کورد، ئەریڤان، ١٩٨٥، س . ٣٤٤ . .

٥- م. و. خامۆیان، فەرهەنگا کوردێ-روسییە فرازیۆلۆگی، ئەریڤان، ١٩٧٩ ، رووپ. ١٦٠ .

٦- نورا جەواری، سترانێ کوردایە جماعەتییێ ، ئەریڤان، ١٩٨٣، رووپ. ١٢٨ .

٧- نورا جەوەری، رووپ . ١٦٦ .

٨- نورا جەوەری، رووپ . ١٣٧ .

٩- Kürt Halk Türküleri (کلام و سترانێن کورد)، ئانکارا، ١٩٩١، رووپ ١٧٨ . ئامادەکار: مەحمەت بایراک.

١٠- حەجییێ جندی، رووپ ٧١ .

١١- جگەرخوین، فۆلکلۆرا کوردی، ستۆکهۆلم، ١٩٨٨، رووپ. ١٣٣ .

١٢- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا، مۆسکۆڤ، ١٩٧٨، جیلت:١، رووپ. ٣٧٣ .

١٣- حەجییێ جندی، رووپ. ١١٠ .

١٤- جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردێ سورییێ، ئەریڤان، ١٩٨٥، رووپ. ٢٤١ .

١٥- جگەرخوین، رووپ. ١١٢ .

١٦- زەینەلعابدین زنار، خوەنچە V، رووپ. ٤٨ .

١٧- رۆژا نوو، هەژمار:١٨ .

١٨- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (ئەڤ خەباتا قەناتێ کوردۆ بەری مرنا وی وەک





دەستنڤیس هاتییە ئامادەکرن، هین چاپ نەبوویە.

١٩- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی، د ناڤ ڤێ خەباتا نەچاپبووی دە، قەناتێ کوردۆ چەند دەستانێن کو د ناڤ کوردێن ئیرانێ دە بەلاڤ بوونە، قولباندییە زاراڤێ کورمانجی. ژ ئالییێ دن چەند دەستانێن زاراڤێ کورمانجی ژی، یێن وی خوە بەرەڤ کرنە، د ناڤ ڤێ دەستنڤیسێ دە جیە گرتنە.

٢٠- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیس).

٢١- مەحمەد بایراک، رووپ. ١٠١ .

٢٢- جەلیلێ جەلیل، رووپ. ٢٢٣ .

٢٣- جگەرخوین، رووپ. ١١٦ .

٢٤- جگەرخوین، رووپ. ١٦٤ .

٢٥- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیس).

٢٦- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیس).

٢٧- حەجییێ جندی، رووپ. ٧٣ .

٢٨- فەرهات، گۆڤەند - Kürleri Türkülerinden ögrenmek, ، کۆلن، ١٩٩٠ ، رووپ. ١٣ .

٢٩- ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا، جیلت ١، ٤١١ .

٣٠- هاوار، هەژمار: ٣٧ .

٣١- حەجییێ جندی، رووپ. ٣٣ .

٣٢- نورا جەواری، رووپ. ١٤٥ .

٣٣- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی، (دەستنڤیس).

٣٤- قەناتێ کوردۆ، بەیتێد کوردی، (دەستنڤیس).

٣٥- هاوار، هەژمارا: ٣٨ .

٣٦- جگەرخوین، ١٥١ .

٣٧- جەلیلێ جەلیل، رووپ. ٢٤٥ .

٣٨- جەلیلێ جەلیل، رووپ. ٢١٦ .

٣٩- رۆژا نوو، هەژمار: ٣٦ .

٤٠- حەجییێ جندی، رووپ. ٧١ .

٤١- ژ ئارشيڤا م. ئارارات .

٤٢- سەگڤان عەبدولحەكيم، مەحمەد عارفێ جزيرى -كەوێ ربادە، ستۆكهۆلم، ١٩٩٠، رووپ. ٣٠ .

٤٣- رۆژا نوو، هەژمار: ٥٦ .

٤٤- نورا جەوارى، رووپ. ١٤٩ .

٤٥- حەجييێ جندى، رووپ. ١٢٢ .

٤٦- رۆژا نوو، هەژمار: ٦ .

٤٧- حەجييێ جندى، رووپ. ٢٠١ .

٤٨- حەجييێ جندى، رووپ. ١٩٨ .

٤٩- حەجييێ جندى، رووپ. ٢٠١ .

٥٠- جەليلێ جەليل، رووپ. ٢٧٠ .

٥١- نورا جەوارى، رووپ. ١٢٨ .

٥٢- رۆژا نوو، هەژمار: ٥٥ .

٥٣- ژ ئارشيڤا م. ئارارات .

٥٤- ژ ئارشيڤا م. ئارارات .

٥٥- رۆژا نوو، هەژمار: ٢٧ .

٥٦- زەينەلعابدين زنار، خوەنچە III، ستۆكهۆلم، ١٩٩١، رووپ. ٤٥ .

٥٧- رۆژا نوو، هەژمار: ٥٥ .

٥٨- حەجييێ جندى، رووپ. ١١٥ .

٥٩- رۆژا نوو، هەژمار: ٤٥ .

٦٠- حەجييێ جندى، رووپ. ١١٥ .

٦١- زەينەلعابدين زنار، خوەنچە II، ستۆكهۆلم، ١٩٩٠، رووپ. ١٠٩ .

٦٢- حەجييێ جندى، رووپ. ٣٠ .

٦٣- قەناتێ كوردۆ، بەيتێد كوردى (دەستنڤيس)

٦٤- حەجييێ جندى، رووپ. ٧٦ .

٦٥- حەجييێ جندى، رووپ. ٤٧ .

٦٦- هاوار، هەژمار: ٦ .



٦٧- حەجييێ جندى، رووپ. ١٠٨ .

٦٨- جگەرخوين، رووپ. ١٤٦ .

٦٩- جەليلێ جەليل، رووپ. ٢٤٥ .

٧٠- ئۆرديخانێ جەليل و جەليلێ جەليل، جيلت I، رووپ. ٣٥٣ .

٧١- حەجييێ جندى، رووپ. ٨٨ .

٧٢- هاوار، هەژمار: ٢٨ .

٧٣- نورا جەوارى، رووپ. ١٦٢ .

٧٤- ژ. س. موسائەليان، زەمبيل فرۆش - دەستانا كوردى و شاخێن وێ، مۆسكۆڤ، ١٩٨٣، رووپ. ١٣٨ .

٧٥- مەلە مەحموود ديرشەوى، مشتاخا چييا - ژ گۆتنێن پێشييا، ستۆكهۆلم، ١٩٨٩، رووپ. ١٣٧ .

٧٦- حەجييێ جندى، رووپ. ١٦٣ .

٧٧- رۆژا نوو، هەژمار: ١١ .

٧٨- جگەرخوين، رووپ. ١٤٧ .

٧٩- رۆژا نوو، هەژمار: ٥٧ .

٨٠- ئۆرديخانێ جەليل و جەليلێ جەليل، رووپ. ٤١١ .

٨١- قەناتێ كوردۆ، بەيتێد كوردى (دەستنڤيس).

٨٢- قەناتێ كوردۆ، بەيتێد كوردى (دەستنڤيس).

٨٣- قەناتێ كوردۆ، بەيتێد كوردى (دەستنڤيس).

٨٤- جەليلێ جەليل، رووپ. ٢٥٠ .

٨٥- رۆژا نوو، هەژمار: ٨ .

٨٦- رۆژا نوو، هەژمار: ٢٢ .

٨٧- حەجييێ جندى، رووپ. ١٤٥ .

٨٨- نورا جەوارى، كلامێد جماعەتا كوردايە گۆڤەندێ، ئەريڤان، ١٩٦٤ ، رووپ. ٦٤ .

٨٩- جەميلا جەليل، سترانێ جماعەتا كوردا، ئەريڤان، ١٩٧٧، رووپ. ٣٤ .

٩٠-حەجييێ جندى، رووپ. ٤١ .

٩١-جەليلێ جەليل، رووپ ٢٥٥ .

# جەرباندنەکە بیبلیۆگرافییا فۆلکلۆرا کوردی

(د ڤێ جەرباندنا بیبلیۆگرافیک دا ١٢٥ چاڤکانییێن کو ل سەر فۆلکلۆرا کوردی هاتنە وەشاندن، جیه گرتنە.)


. Abbas, Hilmi, Altkurdiche Kampf und Liebeslieder, München, 1964.

. عەبدولحەکیم، سەگڤان، محەمەد عارفێ جزیری – کەوێ ریادە، ستۆکهۆلم، ١٩٩٠ .

. ئاکرەیی، عەزیز رەشید، چیرۆک و سەرهاتییێن کوردی، دەن هاگ، ١٩٨٢ .

. ئاراس، ئەحمەد، کەر و کولک – میتۆلۆژییا کوردی دە دەستانەک، ئیستەنبۆل، ١٩٩٣ .

. ئاراس، ئەحمەد، سیبابەند و خەجێ – میتۆلۆژییا کوردی دە دەستانەکە ئەڤینی، ئیزمیر، ١٩٩٣ .

. بالی، ئا.، گۆتنێن پێشییان ئێن کوردی، ئیستەنبۆل، ١٩٩٣ .

. بایراک، مەحەمەد، Kürt Halk Türküleri، (کلام و سترانێن کوردی)، ئانکارا، ١٩٩١ .

. بەرز، کۆیۆ، سیبامەند و خەجێ (شاخەکە ئەدەبی)، ستۆکهۆلهم، ١٩٩٣ .

. Berz, Koyo, Na Xumxuma a, Uppsala, 1989.

. Blau, Joyce & Hakem, Helkewt, Perlcs d'un collier, Paris, 1981.

. Blau Joyce, Mémoire du Kurdistan, Paris,1984.

(رووپەلێن ١٥-١٠٠ ژ نموونەییێن فۆلکلۆرا کوردی پێک هاتییە)

. Blau Joyce, Contes Kurdes, Paris, 1986.

. Bois, Tomas, Kurdische Volkdichtung, Bonn, 1985.

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، میر زۆرۆ– مەسەلۆکێد لاوران I، بۆراس، ١٩٨١ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، گورێ بلورڤان– مەسەلۆکێن لاوران II، بۆراس، ١٩٨٢ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، کێز خاتوون – مەسەلۆکێن لاوران III، بۆراس، ١٩٨٢ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، سەرکەتنا مشکان – مەسەلۆکێن لاوران IV، ، ئوپسالا، ١٩٨٤ .





. بۆزئارسلان، م. ئەمین، پەپووک – مەسەلۆکێن لاوران V، ، ئوپسالا، ١٩٨٥ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، مەلایێ مەشهوور – پێکەنۆکێن مەلایێ مەشهوور، ئوپسالا، ١٩٨٦ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، ماسییێن بەژی –پێکەنۆکێن گەلی I، ئوپسالا، ١٩٨٧ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، ژ دینا دینتر – پێکەنۆکێن گەلی II، ئوپسالا، ١٩٨٨ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، ئیلمێ توورک – پێکەنۆکێن گەلیIII، ئوپسالا، ١٩٨٩ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، بووکا گولسوون – پێکەنۆکێن گەلی IV، ئوپسالا، ١٩٩٠ .

. بۆزئارسلان، م. ئەمین، مەلا کولی – پێکەنۆکێن گەلی V، ئوپسالا، ١٩٩١ .

. Brunel, A., Gulusar, Contes et Legendes du Kurdistan, Paris, 1946 .

. جانکورت، زەمبیل فرۆش – هۆزانا چیرۆکێ یا ب ناڤ دەنگ ب دەرخستنەکە نوو، بۆن، ١٩٨٧ .

. جەلیل، جەلیلێ، زارگۆتنا کوردێ سوریایێ، ئەریڤان، ١٩٨٥ .

. جەلیل، جەمیلا، کلامێد جماعەتا کوردا ، ئەریڤان، ١٩٦٤ .

. جەلیل، جەمیلا، کلام و مقامێد جماعەتا کوردا I، مۆسکۆڤ، ١٩٧٣ .

. جەلیل، جەمیلا، سترانێ جماعەتا کوردا، ئەریڤان، ١٩٧٧

. جەلیل، جەمیلا، کلام و مقامێد جماعەتا کوردا II، مۆسکۆڤ، ١٩٨٦ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ، دلۆکێد جماعەتا کوردا، ئەریڤان، ١٩٦٤ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ، مەسەلە و مەتەلۆکێد جماعەتا کوردا II، ئەریڤان، ١٩٧١ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ، دەستانا کوردی یا مێرخاسییێ «خانێ لەپزێرین»، مۆسکۆڤ، ١٩٦٧ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ، مەسەلە و مەتەلۆکێد جماعەتا کوردا I، ئەریڤان، ١٩٦٩ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ، سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقییێ، ئەریڤان، ١٩٧٥ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ و جەلیل، جەلیلێ، مەسەلەو مەتەلۆکێد جماعەتا کوردا (ب رووسی)، مۆسکۆڤ، ١٩٧٢ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ و جەلیل، جەلیلێ، چیرۆکێ جماعەتا کوردا، ئەریڤان، ١٩٧٤ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ و جەلیل، جەلیلێ، زارگۆتنا کوردا I-II، مۆسکۆڤ، ١٩٧٨ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ و جەلیل، جەلیلێ، گولانچکزێرین (نموونەییێن فۆلکلۆرا کوردا)، ئەریڤان، ١٩٨٤ .

. جەلیل، ئۆردیخانێ و جەلیلێ، جەلیل و جەلیل، زینا، چیرۆک، ئەفسانەو ریڤایەتێن کوردی (ب رووسی)، مۆسکۆڤ، ١٩٨٩ .

. جەلیل، زینا و ئالەنس، ئا. ، چیرۆکێن کوردی یێن گەلی (ب زمانێ لیتڤانی)، بیلینوس، ١٩٧٧ .

. جەواری، نورا، کلامێد کوردایە گۆڤەندێ، ئەریڤان، ١٩٦٤ .

. جەواری، نورا، ئەفرانداربیا کوردا یا سترانێن گەلی (ب رووسی)، ئەریڤان ، ١٩٧١ .

. جەواری، نورا، سترانێ کوردایە جمەتیبیێ، ئەریڤان، ١٩٨٣ .

. Chaliand, Gerard, poesie populaire des Turcs et des Kurdes, Paris, 1961 .

. جگەرخوین، فۆلکلۆرا کوردی، ستۆکهۆلم، ١٩٨٨ .

. جگەرخوین، گۆتنێ پێشیبیا، شام، ١٩٥٧ .

. جندی، حەجیبێ و ئەڤدال، ئەمینێ، فۆلکلۆرا کورمانجا، ئەریڤان، ١٩٣٦ .

. جندی، حەجیبێ، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ، کتێبا I ، ئەریڤان، ١٩٦١ .

. جندی، حەجیبێ، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ، کتێبا II ، ئەریڤان، ١٩٦٢ .

. جندی، حەجیبێ، ستران و چیرۆکێد کوردی یێن ئەپیکی، مۆسکۆڤ، ١٩٦٢ .

. جندی، حەجیبێ، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ، کتێبا III ، ئەریڤان، ١٩٦٩ .

. جندی، حەجیبێ، کلامێد جماعەتا کوردایە لیریکیبیێ، ئەریڤان، ١٩٧٢ .

. جندی، حەجیبێ، شاخێد ئەپۆسا «رۆستەمێ زالە» کوردی (ب رووسی)، ئەریڤان، ١٩٧٧ .

. جندی، حەجیبێ، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ، کتێبا IV ، ئەریڤان، ١٩٨٠ .

. جندی، حەجیبێ، مەسەلە و خەبەرۆکێد جماعەتا کوردا، ئەریڤان، ١٩٨٥ .

. جندی، حەجیبێ، حکیاتێد جماعەتا کوردیێ، کتێبا V ، ئەریڤان، ١٩٨٦ .

. چەم موونزوور، تایێ کلامێ دێرسم، ستۆکهۆلم، ١٩٩٣ .

. دەنز، حوسەین، گۆتنێ پێشیبیێ کوردا، ئیستەنبۆل، ١٩٩١ .

. Der Löwe des Daroghas und andere Kurdische Fa
st, Polten &wîen, (ژ ئالییێ کوردێ ئاووستوریێ ب ئالمانی هاتیە وەشاندن)beln. 1992.

. دێرشەوی، مەلە مەحموود، مشتاخا چیا – ژ گۆتنێن پێشیبیا، ستۆکهۆلم، ١٩٨٩ .

. دەستانا مەمێ ئالان، ئیستەنبۆل، ١٩٧٨ .

. دژوار، عەگید، یەکتیبیا چووکان – چیرۆکێن کوردی، ستۆکهۆلم، ١٩٩٠ .

. Düzgün, Mustafa, Dersim Türküleri, Enqere, 1992 .





. ئەردەم، حووسەین، سیبیابەند و خەجێ (ب ئالمانی و ترکی)، ئەسەن، ١٩٨٥ .

. ئەڤدال، ئەمین، مەمێ و زینێ، ئەریڤان، ١٩٥٨ .

. فارزۆف، ئی. و رودەنکۆ، م. ، چیرۆکێن کوردی (ب رووسی)، مۆسکۆڤ، ١٩٥٩

. Ferhat, Govend - Kürtleri Türklerinden Ögrenmek, . (ب ترکی و ئەلمانی)، کۆلن، ١٩٩٠ .

. فەتتاحی قازی، قادری، مەهر و وەفا، تەبریز، ١٩٦٦ .

. فەتتاحی قازی، قادری، شێخ سەنعان، تەبریز، ١٩٦٧ .

. فەتتاحی قازی، قادری، بەهرام و گولەندام، تەبریز، ١٩٦٨ .

. فەتتاحی قازی، قادری، شۆر مەحموود و مەرزنگان، تەبریز، ١٩٦٩ .

. فەتتاحی قازی، قادری، شێخ فەرخ و خاتوون ئاستی، تەبریز، ١٩٧٢ .

. فەتتاحی قازی، قادری، سەید و میر سەیفوددین بەگ، تەبریز، ١٩٧٦ .

. فەتتاحی قازی، قادری، ئامسال ڤاهەکام –ە کوردی، تەبریز، ١٩٨٥ .

. Helimoglu, Muhsine, Cigaramin Üstünde Bir Topal Karinca, . Ankara, 1992 (پرانیبیا ڤان چیرۆکان ل گەلەک هەرێم و دەڤەرێن کوردستانێ هاتینە بەرەڤ کرن).

. حەقی شەوەیس، ئیسماعیل، قسەی پێشینان، بەغدا، ١٩٣٣ .

. Hugo, Makas, Kurdische Texte im Kurmanci - Dialekte aus der Gegend Von Mardin, Leningrad, 1926 .

. کوردۆ، قەناتێ، بەیتێد کوردی (دەستنڤیسە).

. Le Coq, Albert Von, Kurdische Texte, Berlin,1903. . Lerx, Peter, Forschungen über die Kurden und die iranischen Nordchaldäer I-II,St, Petersburg, 1857-1858.

. Lescot, Roger, Textes Kurdes I-II, Paris-Beyrut, 1940-1942.

. لیسکو، رۆجەر، چیرۆکێن کوردی، ستۆکهۆلم، ١٩٨٧ .

. لەڤەندی، مەحموود، مالا خوەدێ (پێکەنین)، ستۆکهۆلم، ١٩٩٢ .

. Mackenzie, D. N., Kurdish Dialect Studies II,
(تەکستێن فۆلکلۆریک) London, 1962.

. مالمیسانژ، فۆلکلۆرێ مارا چەند نموونەی، ئوپسالا، ١٩٩١ .

. Mam und Zin - Kurdische Volksepos in der Fassung Von Roger Lescot und L. Ch. Wentzel, Zurich, 1980.

. Mann, Oskar, Kurdische- Persische Forschungen, Abt. IV : Die Mundart der Mukri Kurden I-II, Berlin, 1906-1909.

. Mem and Zin, Kurdistan‘s national epic, Amsterdam, 1968.

. Mem och Zin, Helsingfors, 1980.

. مەتێ، حەسەنێ، ئاردوو (کورتە چیرۆکێن گەلێری)، ستۆکهۆلم، ١٩٩٠.

. مهۆتولی، سەلاحەددین، چیرۆکێن کوردان، ئیستەنبۆل، ١٩٩١ .

. موکری، موحەممەد، گورانییا تاراناهایا کۆردی، تەهران، ١٩٥١ .

. موکری، موحەممەد، لالەگەندە دە بزان - و مانژا، پاریس، ١٩٦٦ .

. موسائەلیان، ژ-س.، سترانێن کوردی یێن گەلەری (ب رووسی)، مۆسکۆڤ، ١٩٨٥ .

.موسائەلیان، ژ، س، زەمبیل فرۆش- پۆئەما کوردی و شاخێن وێ یێن ئەدەبی و فۆلکلۆریک، موسکۆڤ، ١٩٨٣ .

. Nebez, cemal,sprichwörter und Redensrten aus Kurdistan, Müchen, 1970

. Nebez, cemal, kurdishe Märchen und Volkserzäh Lungen, München, 1972.

. ئۆربەلی، ئی، ئا.، ل موکسییێ ژیین و فۆلکلۆر (ب رووسی)، موسکۆڤ، ١٩٨٢ .

. Paul- Marguerite, Lucy and Bedirxan, Kamuran, Proverbes Kurdes, Paris, 1936.

. پیرەمێرد، دوانزدە سییارێ مەریوان، سولەیمانییە، ,١٩٣٥

. Prym, E. and Socin, A., Kurdische sammlungen, st. Peters-burg I- II, 1887-1890.

. رەسوول عیزەدین موستافا، ئەدەب-ی فۆلکلۆری کوردی، بەغدا، ١٩٧٠ .

. رەسوول ئیبراهیم، شوکرییە، پەندی پێشینییان و قسەی نەستەقی کوردی ناوەرۆکی فکری -و- ئەدەبی، بەغدا، ١٩٨٤ .

. رەش، کۆنێ، ژ زار گۆتنا کوردی- سەرپێهاتییێن میران، بەیرووت، ١٩٩١ .

. رودەنکۆ، م .ب.، چیرۆکین کوردی یێن گەلی (ب رووسی)، موسکۆڤ، ١٩٧٠ .

. رودەنکۆ، م. ب.، پۆەزییا کوردی یا شینێ (ب رووسی)، مۆسکۆڤ. ١٩٨٢ .

. رودەنکۆ، م. ب.، شاخێن ئەدەبی و فۆلکلۆریک یێن پۆەما کوردی «یوسف و زەلێخا» (ب رووسی)، مۆسکۆڤ، ١٩٨٦ .





. Sabar, Yona, The Folk Literature of the kurdistani Jews, Michigan, 1992.

. شاربازێری، ئو.، گەوهەرێ گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک، بەغدا، ١٩٨١ .

. سەجادی، عەلائەدین، رشتەی مرواری I-XIII بەغدا، ١٩٥٦٠ - ١٩٨٣ .

. سۆئانە، ئە، ونکتن، ب، چیرۆکا سوتو و تاتۆ (چاپەکە تەزە، ب کوردی و ئینگیلیزی)، لۆندۆن، ١٩٨٨ .

شەمۆ، عەرەبێ،-

. Die drei Glatzköpfe- kurdische volksmärchen, Berlin, 1977.

. تیگریس، ئامەد و مۆتکی، رۆمان، کەن و گرین (پێکەنین) ستۆکهۆلم، ١٩٨٩ .

خال،م.، پەند-ی پێشینان، بەغدا، ,١٩٥٧

. yavuz, Muhsine Helimoglu,Diyarbakir Efsaneleri, Istanbul, 1993.

هەردو جلد ب هەڤرا (جلد ١: ١٩٨٩، جلد II: ١٩٩٠).

. Wentzel, Luise charlotte, Kurdische Marchen, Düsseldorf 1978.

. Wikander, Stik, Recueil de textes Kourmandji, Uppsala, 1958.

. Zaza Nureddine, Contes et Poemes Kurdes 1974.

. زنار، زەینەلعابەدین، خوەنچە I (گۆتنێن پێشینان، کلام- دیالۆک و چیرۆک)، ستۆکلهۆلم، ١٩٨٩ .

. زنار، زەینەلعابەدین، خوەنچە II (کلام- دیالۆک و چیروک)، ستۆکهۆلم، ١٩٩٠ .

. زنار، زەینەلعابەدین، خوەنچە IV (کلام، لاوژا مەسیP، مەسەلۆک و چیرۆک)، ستۆکهۆلم، ١٩٩٠ .

. زنار زەینەلعابەدین، خوەنچە V (کلام، سەرپێهاتی، مەسەلۆک و چیرۆک)، ستۆکهۆلم، ١٩٩١ .

. زنار زەینەلعابەدین، خەجێ و سیابەند (شاخەکە ئەدەبی)، ستۆکهۆلم، ١٩٩٢ .

. زنار زەینەلعابەدین، خوەنچە VI (کلام، سەرپێهاتی، مەسەلۆک و چیرۆک) ستۆکهۆلم، ١٩٩٣ .

. زنار زەینەلعابەدین، خوەنچە III (کلام، مەتەلۆک و چیرۆک) ستۆکهۆلم، ١٩٩١ .